پڕفرۆشترین یادداشتنامەی دونیا



# سێشەممان لەگەڵ موری

میچ ئەلبۆم

وەرگێڕانی جوتیار ژاژڵەیی

# پڕفرۆشترین یاداشتنامەی دونیا

وەرگێڕدراوەتە سەر (٣٢) زمانی جیهانیی و لە (٣٧) وڵاتدا بڵاوکراوەتەوە

## پرۆگرامی کۆرسەکە

مامۆستا کۆنەکەم دوا کۆرسی ژیانی هەفتەی جارێک لەماڵەکەی خۆی و لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەیدا گوتەوە. لەو ژوورەدا مامۆستا بەدەم وانە گوتنەوەوە زوو زوو سەیری گوڵە زەمبەقەکانی دەکرد و سەرنجیدەدا چۆن گوڵە پەمەییەکانیان دەکرێنەوە. کۆرسەکە سێشەممان دەخوێندرا. لەسەر هیچ کتێب و پرۆگرامێک نەدەڕۆیشت، یەک وانەشی هەبوو: «مانای ژیان،»، کە لەئەزموونەوە دەگوترایەوە.

کۆرسەکە نمرەی تێدا نەبوو، بەڵام هەموو هەفتەیەک تاقیکردنەوەی زارەکی ئەنجامدەدرا. دەبوو وەڵامی هەندێک پرسیار بدەیتەوە و هەندێک پرسیاریش بکەیت، پێویستیش بوو ناوبەناو چەند ڕاهێنانێکی جەستەیی بکەیت، بۆ نموونە سەری مامۆستاکەت بەرز بکەیتەوە بۆسەر سەرینەکەی، یان عەینەکەی بۆ بخەیتەوە سەر لووتی. ئەگەر لەکاتی خواحافیزیدا ماچێکت بکردایە، دەبوویت بە قوتابییەکی باشتر.

لە کۆرسەکەدا پێویستی نەدەکرد خوێندکار هیچ کتێبێکی پێبێت، لەگەڵ ئەوەشدا چەندین بابەتی گرنگی تێدا تاووتوێ دەکران، وەک خۆشەویستی، کار، کۆمەڵگە، خێزان، پیربوون، لێخۆشبوون و لەکۆتاییشدا مردن. کۆتا وانەی کۆرسەکە ماوەکەی زۆر کورت بوو، تەنیا چەند وشەیەک بوو، دواتریش لەجیاتی ئاهەنگی دەرچوون

پرسە دانرا.

هەرچەندە کۆرسەکە تاقیکردنەوەی تێدانەبوو، بەڵام دەبوو لەکۆتاییدا باسێکی درێژ بنووسیت لەسەر ئەوەی فێری ببوویت. ئەو کتێبەی ئێستا بەدەستتەوەیە، ئەو باسەیە، کە من لەو کۆرسەدا بۆ مامۆستا کۆنەکەمم نووسی، کۆرسێک، کە تەنها یەک خوێندکاری هەبوو:

ئەویش من بووم.

بەهارێکی درەنگی ساڵی ١٩٧٩ یە و دوانیوەڕۆیەکی گەرم و شێداری شەممەیە. بەسەدان کەس بەتەنیشت یەکەوە و لەسەر کورسی تەختە لەناو باخچەی بەشەکەماندا دانیشتووین. هەموومان ڕۆبی شینی پۆلستەرمان لەبەردایە. دانیشتووین و بەبێزارییەوە گوێ بۆ وتاری درێژ درێژ دەگرین. کاتێک ئاهەنگەکە تەواو دەبێت، هەموو پێکەوە کڵاوەکانمان هەڵدەدەین بۆ ئاسمان و ئیتر بەفەرمی لە زانکۆی (براندایس)ی شاری (واڵت هام) کە سەر بەویلایەتی (ماسەچوستس)ی ئەمەریکایە، دەردەچین. بەم دەرچوونەمان پەردە لەسەر منداڵیی زۆربەمان دادەدرێتەوە.

پاش ماوەیەکی کەم (مۆریی شوارتز) دەبینم و بەدایک و باوکمی دەناسێنم. مۆریی خۆشەویسترین مامۆستامە. پیاوێکی باڵاکورتە و بەهەنگاوی بچووک دەڕوات، وەک ئەوەی بترسێت لەناکاو با هەڵیگرێت و بەرزی بکاتەوە بۆناو هەورەکان. مۆریی بەو ڕۆبەی بەریەوە هەندێکجار وەک پەیامبەرێک و هەندێکجار وەک کارەکتەری ناو فیلم کارتۆنەکان دێتەبەرچاو. دوو چاوی سەوزی گەشی هەیە و قژێکی ماشوبرنجی تەنک تاسەر ناوچاوانی هاتووە، دوو گوێی زل و لوتێکی سێگۆشەیشی پێوەیە. برۆکانی پڕن و ئەوانیش وەک قژی خەریکە ماشوبرنجی دەبن. هەرچەندە ددانەکانی سەرەوەی تێکچوون و ئەوانەی خوارەوەشی بەناوداچوون، وەک ئەوەی یەکێک مشتێکی قایمی لێدابن،

کاتێک پێدەکەنێت دەڵێت یەکەم نوکتەی دونیا بۆ ئەو کراوە.
مۆریی کەمێک باسی من بۆ دایک و باوکم دەکات، پێیاندەڵێت:
کوڕێکی چاکتان هەیە.

منیش سەر دادەخەم و بەشەرمەوە سەیری بەردەمی خۆم دەکەم. پێش ئەوەی بڕۆین، دیارییەک دەدەمە دەستی. دیارییەکەم جانتایەکی مەیلەو زەردە و یەکەم پیتی ناوی خۆی و باوکی لەسەر نوسراوە. ڕۆژێک پێش ئاهەنگی دەرچوونەکەمان لە بازاڕێکی گەورەدا بۆم کڕی. نەمدەویست مامۆستایەکی خۆشەویستی وەک مۆریی لەبیربکەم، لەڕاستییدا ڕەنگە ئەو جانتایە بۆ ئەوە بوو بێت ئەو من لەبیر نەکات.

بەدڵخۆشییەوە سەیرێکی جانتاکە دەکات و پێمدەڵێت: میچ، تۆ یەکێکیت لە قوتابییە زۆر باشەکانم. ئینجا باوەشم پێدادەکات، هەست بە دەستە باریکەکانی دەکەم لەسەر پشت و شانەکانم. من لەو درێژترم، لەبەرئەوە لەکاتی باوەشەکەدا کەمێک هەست بە تەریقبوونەوە دەکەم. وادەردەکەوێت من باوک بم و ئەو منداڵەکە بێت. پرسیارم لێدەکات ئایا دوای دەرچوونیشم هەر پەیوەندیمان دەبێت، منیش بەبێ هیچ دوودڵییەک وەڵامی دەدەمەوە: بەدڵنیاییەوە.

کە باوەشەکەمان تەواو دەبێت و دەگەڕێتەوە دواوە، سەیرێکی دەکەم و دەبینم هەردووچاوی پڕبوون لە فرمێسک.

## بابەتەکان

لەهاوینی ساڵی ١٩٩٤دا سزای مردنی بەسەردا درا، بەڵام مۆریی پێش ئەوەش دەیزانی ڕۆژێکی ڕەشی ئاوا چاوەڕێیەتی. هەر ئەو ڕۆژەی بەناچاری وازی لە سەما هێنا لەوە دڵنیابوو درەنگ یان زوو شتێکی خراپ ڕوودەدات.

مامۆستا کۆنەکەم ساڵانێکی زۆر بەبێ دابڕان سەمای کرد. ئەو بەلایەوە گرنگ نەبوو ئەو مۆسیقایەی سەمای لەسەر دەکات چییە، کەیفی بەهەموو جۆرە مۆسیقایەک دەهات. هەر گوێی لەشتێک بووایە چاوی دادەخست و بەهێواشی دەکەوتە جوڵە تا هەموو ئەندامەکانی لەشی دەخستە سەر ئاوازەکە. هەموو کات بەجوانی سەمای نەدەکرد، بەلاشییەوە گرنگ نەبوو هاوڕێی سەمای لەگەڵە، یان نا، بۆخۆی بەتەنیا سەمای دەکرد.

مۆریی هەموو شەوانی چوارشەممەیەک دەچوو بۆ کەنیسەی (هارڤارد سکوێیەر) بۆ سەماکردن. لە هۆڵی کەنیسەکەدا گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ و بڵندگۆی گەورەیان دانابوو، مۆرییش بەخۆی و تیشێرتە سپی و پانتۆڵە ڕەشەکەیەوە بەناو قەرەباڵغییەکەدا، کە زۆریەیان خوێندکاریوون، دەهات و دەچوو. خاولییەکەشی دەخستەسەر ملی و هەر گۆرانییەک لێبدرایە سەمای لەسەر دەکرد، خۆی دەخولاندەوە و دەستی دەجولاند هەتا ئارەق بەناوەڕاستی پشتیدا دەهاتەخوار.

لەو کەنیسەیە کەس نەیدەزانی مۆریی خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لەکۆمەڵناسییدا و مامۆستای زانکۆیە و تەنانەت چەندین کتێبی باش باشیشی نووسیوە. خەڵکەکە زیاتر وەک پیرەمێردێکی شێتۆکە تەماشایاندەکرد.
جارێکیان، مۆریی خۆی شریتێکی کڕی و داوایکرد ئەوەی بۆ بخەنەسەر. دوای ئەوەی مۆسیقاکە دەستیپێکرد، چووەسەر تەختەی سەماکە و بەتەنها داگیریکرد بۆ خۆی. بەهەرچوارلادا کەوتە جوولە و وەک عاشقێکی لاتینی سەمای دەکرد. کاتێک تەواو بوو، هەموو چەپڵەیان بۆلێدا و دەستخۆشییان لێکرد. ئەو ساتە بۆ مۆریی ئەوەندە خۆش بوو، کە دەیتوانی تاهەتایە تیایدا بمێنێتەوە.
پاش ماوەیەک مۆریی لەسەماکردن وەستا. لە شەستەکانی تەمەنیدا تووشی ڕەبۆ بوو. ڕۆژێک بەقەراغ ڕووباری (چارلس)دا پیاسەی دەکرد، سەرمایەک لێیدا و بەتەواوی هەناسەدانی لێ قورسکرد. مۆریی بەپەلە گەیەنرایە نەخۆشخانە و دەرزی (ئەدرینالین)ی لێدرا.
دوای چەند ساڵێکی کەم وایلێهات تەنانەت نەیدەتوانی بەئاسانی پیاسەش بکات. لەئاهەنگی ساڵیادی لەدایکبوونی هاوڕێیەکیدا هەندێک جوولەی زۆر سەیری کرد وەک ئەوەی هاوسەنگی جەستەی خۆی بۆ ڕانەگیرێت. شەوێکیتر لەقادرمەی هۆڵێکی شانۆوە کەوتەخوارەوە و کەسەکانی دەوروبەری دیمەنەکەیان زۆر بەلاوە سەیربوو. یەکێک لەوکەسانەی لەوێ بوو هاواریکرد: کاکە بۆشاییەکی بۆ بکەنەوە هەوایەک هەڵمژێ.
کاتێک ئەمە ڕوویدا مۆریی لە حەفتاکانی تەمەنیدا بوو، لەبەرئەوە هەندێک لەوانەی چاویان لەکەوتنەکەی بوو لەژێر لێوەوە گوتیان: ئاااى پیریی!. وایانگوت و هەڵیانساندەوە.
مۆریی هەر زوو زانی مەسەلەکە شتێکی ترە و دەبێت ناتەواوییەک

لە بەشێکی جەستەیدا هەبێت. پیریی تەنیا هۆکاری ئەم حاڵەتانە نەبوو. ئەو ماوەیە مۆریی بەردەوام بێهێز و دڵتەنگ دەهاتە بەرچاو. سیستمی خەوتنی تێکچووبوو. شەوێکیان خەوی بینی، کە بەو نزیکانە دەمرێت.

دوای ئەوە زوو زوو سەردانی پزیشکی دەکرد. چووە لای چەندین پزیشک، کە هەریەکەیان پسپۆڕیی لەشتێکدا هەبوو. پشکنینی خوێنیان بۆکرد، پشکنینی میزیان بۆ کرد، لەڕێگەی ناززوورەوە سەیری ناو ڕیخۆڵەکانیان کرد، بەڵام هیچکام لە پزیشکەکان شتێکی بۆ ئاشکرا نەبوو. دواجار یەکێکیان بڕیاریدا پشکنینی ماسولەکەی بکات، بۆ ئەو مەبەستەش پارچەیەکی بچووکی لەماسولکەی پوزی مۆریی بڕی و بردی بۆ پشکنین. دواتر ڕاپۆرتە پزیشکییەکە هاتەوە و دەرکەوت مۆریی نەخۆشییەکی دەماریی هەیە، لەبەرئەوە چەندین پشکنینیتری بۆ کرا. لەیەکێک لەپشکنینەکاندا لەسەر کورسییەکی کارەبایی تایبەت دانیشت و تەزووی کارەبایان بەجەستەیدا برد. دواجار ناتەواوییە دەمارییەکەی مۆریی دۆزرایەوە.

پزیشکەکە سەیرێکی ئەنجامی پشکنینەکانی کرد و گوتی: دەبێت زیاتر لە نەخۆشییەکە بکۆڵینەوە و بەباشی لەگەڵی بڕۆین.

مۆرییش لێی پرسی: بۆ؟ چی هەیە؟

دکتۆرەکە پێیگوت: جارێ تەواو دڵنیا نین. کێشەکەت کەمێک ئاڵۆزە.

کێشەکەی کەمێک ئاڵۆزە؟ ئەوە مانای چی بوو؟

دواجار لەیەکێک لەڕۆژە گەرم و شێدارەکانی ئابی ١٩٩٤ دا، مۆریی و (شارلۆت)ی هاوسەری خۆیانکرد بە نۆڕینگەی پزیشکەکەدا. پێش ئەوەی باسی نەخۆشی و ئەنجامی پشکنینەکان بکەن، پزیشکەکە فەرمووی لێکردن دابنیشن. مۆریی تووشی نەخۆشییەکی بێبەزەیی و کوشندە ببوو: نەخۆشی (ئەی ئێل ئێس) کە تووشی سیستمی

دەماریی مرۆڤ دەبێت. نەخۆشییەکە هیچ چارەسەرێکی زانراوی نەبوو.
مۆریی لە پزیشکەکەی پرسی: باشە دکتۆر چۆن تووشی ئەمە بووم؟
لەڕاستییدا کەس نەیدەزانی چۆن و لەچییەوە تووشی بووە.
ئەمجارە پرسییەوە: ئەی کوشندەیە؟
پزیشکەکە بەناچاری وەڵامی دایەوە: بەڵێ.
مۆریی گوتی: کەواتە دەمرم؟
پزیشکەکە دیسان وەڵامی دایەوە: بەڵێ دەمریت! زۆریش بەداخەوەم، کە وا دەڵێم.
پزیشکەکە بۆماوەی نزیکەی دوو کاتژمێر لەگەڵ مۆریی و شارلۆت دانیشت و ژن و مێردەکە هەر پرسیارێکیان لێبکرایە بەئەوپەڕی ئارامگرییەوە وەڵامی دەدانەوە. کاتێکیش مۆریی و شارلۆت ڕۆیشتن، وەک ئەوەی حسابی بانکییان کردبێتەوە، هەندێک نامیلکەی پێدان، کە زانیاری زیاتریان لەسەر نەخۆشی (ئەی ئێل ئێس) تێدابوو.
لەدەرەوە ڕۆژەکەی خۆش و دڵڕفێن بوو. خەڵک خەریکی ئیشوکاری خۆیان بوون، ژنێک بەخێرایی ڕایدەکرد فریا بکەوێت پارە بخاتە ناو سندوقی کرێی وەستانی ئوتومبێلەوە، ژنێکیتر لەبازاڕ دەهاتەوە و سەوزە و میوەی بەدەستەوەبوو. هەزارویەک بیر بەمێشکی (شارلۆت)دا دەهاتن. بەخۆی دەگوت: بڵێی چەندمان کات مابێ بەیەکەوە؟ حاڵمان چۆن بڕوا تا ئەوکاتە؟ تۆ بڵێی بتوانین پارەی پێداویستییەکانی ژیانمان دابین بکەین؟
بەپێچەوانەوەی (شارلۆت)ەوە، مۆریی سەری لە ئاساییبوونی ڕۆژەکە و کەسەکانی دەوروبەری سوڕمابوو. لەدڵی خۆیدا دەیگوت: ئێستا کە من وا دەمرم نابێ دونیا بوەستێ؟ بەڵام دونیا، نەک هەر نەوەستابوو، بگرە کەس هەستیشی بەوە نەدەکرد، کە مۆریی دەمرێت. کاتێک

بەلاوارییەوە دەرگای سەیارەکەی ڕاکێشا و خۆی بە کۆشنەکەدادا، دەتگوت بەردەبێتەوە بۆناو چاڵێکی زۆر قووڵ.
مۆریی بەخۆی گوت: باشە ئێستا من چی بکەم؟



لەکاتێکدا مامۆستا کۆنەکەم خەریکی گەڕان بوو بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارانەدا، کە بۆی دروست ببوون، نەخۆشییەکەی وردە وردە بەسەریدا زاڵدەبوو. ڕۆژ لەدوای ڕۆژو هەفتە لەدوای هەفتە حاڵی خراپتر دەبوو. ڕۆژێکیان کاتێک سەیارەکەی دەهێنایە ژوورەوە بۆناو گەراجەکە، بەئاستەم توانی پێی بە ئیستۆپدا بنێت و سەیارەکە بوەستێنێت. ئیتر لەدوای ئەوەوە سەیارەی لێنەخوڕییەوە. وایلێهات لەڕۆیشتنیشدا زوو زوو لەتری دەدا، لەبەرئەوە گۆچانێکیان بۆ کڕی و ئیتر لەوەبەدوا پیاسەی بەدەستی بەتاڵەوە نەکردەوە.
سەرەڕای ئەو نۆخە جەستەییە نالەبارەش، مۆریی هەر دەچوو بۆ مەلەکردن بۆ یەکێک لەو مەلەوانگانەی ڕێکخراوێکی مەسیحیی سەرپەرشتیدەکرد، بەڵام کێشەکە ئەوەبوو بۆی دەرکەوت چیتر ناتوانێت لەوێ خۆی جلەکانی دابکەنێت، هەربۆیە یەکەم یارمەتیدەری خۆی بەکرێ گرت کە ناوی (تۆنی) بوو. تۆنی خوێندکاری بەشی (ئاینە جیاوازەکان) بوو، لەهەمانکاتیشدا یارمەتی مۆریی دەدا و دەیبرد بۆ مەلەوانگە و دەیهێنایەوە، لەپێش و دوای مەلەکردنیشدا دەیگۆڕی. لەژووری خۆگۆڕینەکەدا، ئەو کەسانەیتر، کە هاتبوون بۆ مەلە وایان نیشاندەدا سەیری مۆریی ناکەن، بەڵام لەڕاستیدا زوو زوو بەتیلەی چاو سەیریان دەکرد. ئیتر ئەوە کۆتایی ژیانی تایبەتیی و کەسیی مۆریی بوو.
لە پایزی ساڵی ١٩٩٤دا مۆریی دووبارە گەڕایەوە زانکۆی براندایس

بۆ گوتنەوەی دوا کۆرسی خۆی. بێگومان دەیتوانی داوا لەزانکۆ بکات مۆڵەتی بدەنێ و کۆرسەکە نەڵێتەوە، زانکۆش لە باروودۆخەکەی تێدەگەیشتن و مۆڵەتەکەیان دەدایە. ئیتر چ پێویستی دەکرد ئەو هەموو خوێندکار و مامۆستایە لەنزیکەوە ببینن چۆن ئازار دەچێژێت؟ باشتر نەبوو لەماڵەوە دابنیشێت و پشوو بدات؟ باشتر نەبوو زیاتر گرنگیی و کاتی خۆی بۆ پەیوەندییەکانی تەرخان بکات؟ بەڵام مۆریی بیری وازهێنان نەدەچوو بەمێشکیدا، هەربۆیە دواجار بەنارەحەتییەکی زۆرەوە خۆی کرد بەو پۆلەدا، کە سی ساڵ بوو وانەی تێدا دەگوتەوە. لەبەرئەوەی گۆچانی پێبوو، ماوەیەکی ویست تا بەتەواوی گەیشتەسەر کورسییەکەی. دانیشت و عەینەکەکەی لەسەر لوتی هێنایە خوارەوە، ئینجا سەیرێکی ئەو دەموچاوە گەنجانەی کرد، کە هەموو پێکەوە و بەبێدەنگی لێیان دەڕوانی.

مۆریی کەوتە قسە: هاوڕێیانی ئازیزم، ئەوەندەی بزانم ئێوە هەموو هاتوون پێکەوە کۆرسی (سایکۆلۆژی کۆمەڵایەتیی) بخوێنین. من بیست ساڵە ئەم کۆرسە دەڵێمەوە، بەڵام ئەمە یەکەمجارە دەترسم گوتنەوەی کۆرسە ئاسان نەبێ و لێتان تێک بدەم لەبەرئەوەی ئێستا من تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووم. ڕەنگە بمرم و کۆرسەکەمان پێکەوە تەواو نەبووبێ. ئەگەر پێتانوایە ئەمە کێشەتان بۆ دروست دەکات، ئازادن و دەتوانن کۆرسەکە وەرنەگرن، هیچیش پێم ناخۆش نابێ.

مۆریی ئەم ڕستەیەی کۆتایی بەزەردەخەنەوە گوت.

نهێنییە گەورەکەش ئاشکرابوو.



(ئەی ئێل ئێس) وەک مۆمێکی هەڵکراو وایە. دەمارەکانت دەتوێنێتەوە

و جەستەت یەکپارچە دەکاتە مۆمی تواوە. لەزۆربەی حاڵەتەکاندا لە قاچەکانەوە دەستپێدەکات و بەرەو سەرەوە دێت. وردە وردە کۆنترۆڵی ماسولکەکانی ڕانت لەدەست دەدەیت و لەوەبەدوا ناتوانیت هەستیتە سەرپێ. لەقۆناغی کۆتاییشدا، ئەگەر زیندوو بوویت تا ئەوکاتە، کونێک دەکرێتە قورگت و دەبێت لەڕێگەی سۆندەیەکەوە هەناسە بدەیت. هەموو ئەمانە لەکاتێکدا ڕوودەدەن، کە ڕۆحت بەتەواوی بەئاگایە، بەڵام لەبەرگێکی وشکبوودا زیندانی کراوە. ڕەنگە بتوانیت چاو بتروکێنیت، یان وەک کارەکتەری ناو فیلمە خەیاڵە زانستییەکان زمانێک دەربێنیت، بەڵام بەگشتی دەبێت بەکەسێک، کە لە گۆشت و خوێنی خۆیدا بەستوویەتی. هەموو ئەمانە لە پێنج ساڵ زیاتریان پێناچێت، گۆڕانکارییەکانیش هەر لەو ڕۆژەوە دەستپێدەکەن، کە بەڵێننامە لەگەڵ نەخۆشییەکەدا واژۆ دەکەیت.

پزیشکەکان دوو ساڵیان دانا بۆ مۆریی، بەڵام مۆریی بۆخۆی دەیزانی لەوە کەمتری ماوە بۆیە هەر ئەوکاتەی لەنۆرینگەی پزیشکەکەی هاتەدەرەوە و دڵنیابوو شمشێرێک خراوەتە سەر گەردنی، بڕیارێکی گرنگی دا. مۆریی لەخۆی پرسی: باشە ئێستا من دەبێ چاوەڕێ بکەم وشک ببم و بمرم، یان بەباشترین شێوە ئەوکاتە بەکاربهێنم، کە ماومە؟

مۆریی ئامادە نەبوو هەروا بەئاسانی وشک ببێت. شەرمی لەوەنەدەکرد، کە دەمرێت. ئەو مردنی وەک دوا پرۆژەی خۆی تەماشادەکرد، لەڕاستیدا وەک گرنگترین بەشی ژیانی. لەبەر ئەوەش، کە دەیزانی هەموو کەسێک دەبێت تامی مردن بکات، دەیتوانی هێشتا گرنگیی و نرخی خۆی لەبیربێت، شتێکی باشی نەکردووە؟

مۆریی دەکرا ببێتە بابەتی توێژینەوەیەکی مەزن و کتێبێکی گەورە و بەسوود بۆ مرۆڤەکانی دوای خۆی بەجێبهێڵرێت. هەندێکجار دەیگوت:

وەرن بمخوێننەوە. سەرنج بدەن چۆن بەهێواشی بەرەو مردن دەڕۆم، تەماشابکەن و ببینن چیم بەسەردێ. وەرن لێمەوە فێربن.
مۆریی خەریکبوو لە پردی نێوان ژیان و مردن دەپەڕییەوە، بەدەم هەنگاونانیشەوە چیرۆکی گەشتەکەی خۆی بۆ ئێمە دەگێڕایەوە.



کۆرسەکەی ئەو پایزە زۆر خێرا تێپەڕی. حەبەکانی مۆریی زیادیانکرد. پشکنین بووە ڕۆتینێک، کە دەبوو زوو زوو ئەنجامبدرێت. پەرستارەکان دەهاتن بۆماڵەوە بۆ ئەوەی قاچەکانی بۆ بجوڵێنن و نەهێڵن زوو وشک ببن، بۆ بەچالاک هێشتنەوەی ماسولکەکانیشی لەسەرخۆ هەردوو قاچییان بۆ پێشەوە و بۆ دواوە دەجوڵاند، دەتگوت ئاو لەبیر دەردەهێنن. پسپۆڕانی شێلانیش هەفتەی جارێک سەردانیان دەکرد و بەشێلان ئەو گرژییەیان خاو دەکردەوە، کە توشی زۆربەی ماسولەکانی لەشی ببوو. مۆریی لەگەڵ مامۆستایانی ڕۆحییش دادەنیشت و (تێڕامان) ی دەکرد. بیرکردنەوەکانی کەم دەبوونەوە و جیهان لای بچووک دەبۆوە، بچووک تا ئاستی هەڵمژین و دانەوەی هەناسەیەک!
ڕۆژێکیان کاتێک بەخۆی و گۆچانەکەیەوە ویستی بڕواتە دەرەوە، قاچی خستەسەر شۆستەکە و کەوتەخوارەوە بۆسەر شەقامەکە. گۆچانەکەیان بۆ گۆڕی بە دارشەق. لەگەڵ زیاتر لاوازبوونی جەستەیدا، هاتوچۆشی بۆ سەرئاو قورستربوو، لەبەرئەوە لەوەبەدوا بۆ میزکردن جێگاکەی بەجێنەدەهێشت و سەتڵێکی بچووکی بەکاردەهێنا، بەڵام لەکاتی میزکردنــدا دەبوو خۆی بگرێت بۆئەوەی نەکەوێت، ئەمەش مانای وابوو پێویستی بەکەسێکیتر هەبوو سەتڵەکەی بۆ بگرێت لەکاتی میزکردنیدا.

زۆرینەمان ئەگەر ئەو شتەمان بەسەربهاتایە زۆر هەستمان بەشەرم و کەمیی دەکرد، بەڵام مۆریی وەک زۆربەمان نەبوو. کاتێک هەندێک لە هاوڕێ نزیکەکانی سەردانیان دەکرد، پێی دەگوتن: گوێبگرن، میزم دێ، دەبێ یارمەتیشم بدەن. خۆ ئاساییە بەلاتانەوە؟

زۆربەری جارەکان ئاسایی بوو بەلایانەوە.

لەڕاستیدا، ژمارەی ئەوانەی سەردانی (مۆریی)ان دەکرد بەردەوام لەزیادبووندا بوو، (مۆریی)ش ئەوەی پێخۆش بوو. مۆریی لەگەڵ میوانەکانی گفتوگۆی بەکۆمەڵی دروستدەکرد و زیاتر قسەیان لەسەر مردن دەکرد. پێکەوە باسی مانای ڕاستەقینەی مردن و تێڕوانینی کۆمەڵگایان بۆ مردن دەکرد. پێیانوابوو کۆمەڵگە بەبێ ئەوەی لە مردن تێگەیشتبێت لێی دەترسێت. مۆریی بەهاوڕێکانی دەگوت، کە ئەگەر بەڕاستی دەیانەوێت یارمەتی بدەن، نابێت بەزەییان پێیدا بێتەوە، بەڵکو تەنیا دەبێت سەردانی بکەن، تەلەفۆنی بۆ بکەن و وەک جاران باسی کێشەکانی خۆیانی بۆ بکەن. مۆریی بەهەمانشێوەی قۆناغەکانی پێشووتری ژیانی، تا ئەو کاتەش گوێگرێکی زۆر باش بوو. لەگەڵ ئەو بارە نالەبارەی تووشی جەستەی هاتبوو، هێشتا دەنگێکی بەهێزی هەبوو، مێشکیشی بەباشی ئیشی دەکرد و چەندین بیری جیاجیای پێدادەهات. لەڕاستیدا، مۆریی دەیویست بیسەلمێنێت، کە وشەی (مردن) و (بێکەڵک) هاوواتا نین!

ساڵی نوێ هات و تێپەڕی. مۆریی هەرچەندە لای کەس ئەمەی نەگوتبوو، بەڵام دەیزانی ئەوە دوا ساڵی ژیانی دەبێت. ئێستا لەسەر عەرەبانە دادەنیشت و بەردەوام شەڕی لەگەڵ کاتدا دەکرد بەو هیوایەی دەرفەتی ئەوەی هەبێت ئەو شتانە بڵێت، کە هەمیشە ویستبووی لەگەڵ دۆست و خۆشەویستەکانیدا بیانڵێت. کاتێک یەکێک لەناسیاوەکانی لەزانکۆی براندایس بەجەڵتەی دڵ کۆچی دوایی کرد،

زۆرینەمان ئەگەر ئەو شتەمان بەسەربهاتایە زۆر هەستمان بەشەرم و کەمیی دەکرد، بەڵام مۆریی وەک زۆربەمان نەبوو. کاتێک هەندێک لە هاوڕێ نزیکەکانی سەردانیان دەکرد، پێی دەگوتن: گوێبگرن، میزم دێ، دەبێ یارمەتیشم بدەن. خۆ ئاساییە بەلاتانەوە؟
زۆربەری جارەکان ئاسایی بوو بەلایانەوە.
لەڕاستیدا، ژمارەی ئەوانەی سەردانی (مۆریی)ان دەکرد بەردەوام لەزیادبووندا بوو، (مۆریی)ش ئەوەی پێخۆش بوو. مۆریی لەگەڵ میوانەکانی گفتوگۆی بەکۆمەڵی دروستدەکرد و زیاتر قسەیان لەسەر مردن دەکرد. پێکەوە باسی مانای ڕاستەقینەی مردن و تێڕوانینی کۆمەڵگایان بۆ مردن دەکرد. پێیانوابوو کۆمەڵگە بەبێ ئەوەی لە مردن تێگەیشتبێت لێی دەترسێت. مۆریی بەهاوڕێکانی دەگوت، کە ئەگەر بەڕاستی دەیانەوێت یارمەتی بدەن، نابێت بەزەییان پێیدا بێتەوە، بەڵکو تەنیا دەبێت سەردانی بکەن، تەلەفۆنی بۆ بکەن و وەک جاران باسی کێشەکانی خۆیانی بۆ بکەن. مۆریی بەهەمانشێوەی قۆناغەکانی پێشووتری ژیانی، تا ئەو کاتەش گوێگرێکی زۆر باش بوو. لەگەڵ ئەو بارە نالەبارەی تووشی جەستەی هاتبوو، هێشتا دەنگێکی بەهێزی هەبوو، مێشکیشی بەباشی ئیشی دەکرد و چەندین بیری جیاجیای پێدادەهات. لەڕاستیدا، مۆریی دەیویست بیسەلمێنێت، کە وشەی (مردن) و (بێکەڵک) هاوواتا نین!
ساڵی نوێ هات و تێپەڕی. مۆریی هەرچەندە لای کەس ئەمەی نەگوتبوو، بەڵام دەیزانی ئەوە دوا ساڵی ژیانی دەبێت. ئێستا لەسەر عەرەبانە دادەنیشت و بەردەوام شەڕی لەگەڵ کاتدا دەکرد بەو هیوایەی دەرفەتی ئەوەی هەبێت ئەو شتانە بڵێت، کە هەمیشە ویستبووی لەگەڵ دۆست و خۆشەویستەکانیدا بیانڵێت. کاتێک یەکێک لەناسیاوەکانی لەزانکۆی براندایس بەجەڵتەی دڵ کۆچی دوایی کرد،

مۆریی چوو بۆ مەراسیمی بەخاک سپاردنەکەی و دواتر بەخەمباری گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. بەخۆی گوت: بەڕاستی کارەساتە! خەڵک ئەو هەموو قسە جوانانەیان پێیە و من قەت گوێم لەهیچیان نەبووە.
مۆریی بیرۆکەیەکی باشتری لەمێشکدابوو. هەندێک تەلەفۆنی بۆ خزم و دۆستان کرد، دواتر ڕۆژێکی هەڵبژارد و لەدوانیوەڕۆیەکی ساردی یەکشەممەدا ئەندامانی نزیکی خێزانەکەی و هاوڕێکانی کۆکردەوە و لەکاتێکدا، کە هێشتا زیندوو بوو، مەراسیمی بەخاکسپاردنی خۆی ڕێکخست. هەریەک لەئامادەبووان قسەی خۆی کرد و ستایشی مامۆستا کۆنەکەمی کرد. هەندێک گریان، هەندێک پێکەنین. یەکێک لەئامادەبووە ژنەکان ئەم شیعرەی خوێندەوە:
خاڵی ئازیز و خۆشەویستم
دڵە هەمیشە زیندووەکەت
لەگەڵ ڕۆیشتنت بەناو کاتدا
چین چین ناسکتر دەبێتەوە...

مۆریی لەگەڵیاندا پێکەنی و گریا. هەموو ئەو هەستە جوانانەی کە ئێمە هەرگیز دەرفەتی ئەوەمان نابێت بۆ خۆشەویستەکانمانیان دەربڕین، مۆریی لەو دوانیوەڕۆیەدا دەریبڕین. مەراسیمی بەخاکسپاردنەکە زۆر بەسەرکەوتوویی تەواوبوو، تەنیا ئەوە بوو هێشتاش مۆریی زیندوو بوو.
ناوازەترین قۆناغی ژیانی مۆریی خەریکبوو ورده ورده دەردەکەوت.

# خوێندکارەکە

ئێستا دەبێت باسی ئەو شتانە بکەم، کە لەدوای ئەوەی بۆ دواجار باوەشمکرد بەمامۆستا کۆنەکەمدا و بەڵێنم پێدا لێی دانەبڕێم بەسەر من هات. دەبێت دانی پێدابنێم، کە بەڕاستی لەمۆریی دابڕام و لەدوای دەرچوون لەزانکۆ پەیوەندییم پێوە نەکردەوە. لەڕاستیدا، پەیوەندیم لەگەڵ زۆربەی ناسیاوەکانی زانکۆمدا نەما، تەنانەت لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەشدا، کە پێکەوە دەچووین بۆ پیاسە و بیرە خواردنەوە، هەروەها لەگەڵ ئەو کچەش، کە بۆیەکەمجار بەیانییەک بەخەبەرهاتم و لەتەنیشتمەوە بوو.

ساڵانی دوای دەرچوونم لەزانکۆ کردیانم بەکەسێکی زۆر جیاواز لەوەی دەمویست ببم. هەر لەڕۆژی دەرچوونمەوە پەلەی ئەوەم بوو بچمە نیویۆرک و بەهرە و تواناکانم پێشکەشی دونیا و خەڵک بکەم، بەڵام شتەکان وا نەکەوتنەوە. بۆم دەرکەوت دونیا ئەوەندەش خۆش نییە، کە تێی گەیشتبووم. بیستەکانی تەمەنم بەسوڕانەوە و کرێدان و خوێندنەوەی چیرۆکە پۆلیسییەکان بەسەربرد. تێنەدەگەیشتم بۆ ژیان گڵۆپی سەوزم بۆ هەڵناکات. خەونم ئەوەبوو ببم بە ژەنیارێکی بەناوبانگی پیانۆ، بەڵام پاش بەسەربردنی چەند ساڵێکی ڕەش و بێ بەرهەم لە یانە شەوانەکاندا و دوای هەڵوەشانەوەی ئەو هەموو بەڵێنە پوچانەی پێمدرابوون، گروپە مۆسیقییەکەی ئێمەش

هەڵوەشـایەوە و بەرهەمهێنەرەکانیـش هەمـوو کەسـێکیان بـەدڵ بـوو مـن نەبێـت. بەوشـێوەیە ئەسـتێرەی خەونەکـەم ئاوابـوو. ئـەوە یەکـەم شکسـتی ژیانـم بـوو.

هـەر لـەو ماوەیـەدا لەنزیکەوە مردنم بینی. مێردی پـوورم، ئەوپیاوەی فێـری مۆسـیقا و شـۆفێریی کـردم، ئـەو پیـاوەی دەربـارەی کچـان سـەری دەکـردە سـەرم، لەتەمەنـی چـل و چـوار ساڵیدا بەشێرپەنجەی پەنکریـاس کۆچـی دوایـی کـرد. مێـردی پـوورم کەسـێک بـوو هەمیشـە دەمگـوت، کـە گەورەبـووم دەمەوێـت وەک ئـەو بـم. پیاوێکـی باڵاکورتـی قـۆز بـوو، سـمێڵێکی پڕیشـی دەهێشـتەوە. لەزۆربـەی کاتەکانـی دوا ساڵی تەمەنیـدا پێکەوەبوویـن. مـن لـە شـوقەیەکدا دەژیـام، کـە یـەک نهـۆم لەژێـر شـوقەکەی ئـەوەوە بـوو، بۆیـە لەنزیکـەوە دەمبینـی چـۆن جەسـتە بەهێزەکـەی بەهێواشـی دەئاوسـا و وشـک دەبـوو. دەمبینـی چـۆن شـەو لـەدوای شـەو زیاتـر ئـازاری دەچەشـت، چـۆن لەسـەر سفرە نانـی بـۆ نەدەخـورا و لەتـاو ئـازاری گـەدەی هـەر ناڵەناڵـی بـوو، دەمبینـی چـۆن دەسـتی بەسـکییەوە دەگـرت و چاوەکانـی دەنووقانـد، ئینجـا لەئـازاردا تـا دەیتوانـی دەمـی دەکـردەوە و هـاواری دەکـرد: وااااای خوایـە گیـان مـردم! ئێمـەش، مـن و پـورم و دوو کوڕەکـەی، بەبێدەنگی لـەولاوە دەوەسـتاین و بەبـێ ئـەوەی زاتـی ئـەوە بکەیـن سـەیری بکەیـن، قاپەکانمـان کۆدەکـردەوە و سـفرەکەمان هەڵدەگـرت. هیـچ کات لەژیانمـدا ئەوەنـدە هەسـتم بـە بێدەسـەلاتیی نەکـردووە.

شـەوێکی مانگـی مایـس مـن و مێـردی پـوورم لەسـەر باڵکۆنـی شـوقەکەی ئـەو دانیشـتبووین. هەواکـەی زۆر خـۆش بـوو، شـەماڵێکی دەهـات. مێـردی پـوورم سـەیرێکی ئاسـمانی کـرد و پێیگوتـم، کـە ناتوانێـت ساڵێکیتر بەچـاوی خـۆی منداڵەکانـی ببینێـت، کـە دەردەچـن بـۆ پۆلێکیتـر. داوای لێکـردم، کـە مـن ئـاگام لێیـان بێـت و چاودێرییـان

بکەم. منیش داوام لێکرد بەوشێوەیە قسەیە نەکات، بەڵام ئەو بە خەمبارییەوە سەیرێکی کردم و هیچی نەگوت. دوای چەند هەفتەیەک بەیەکجاریی ماڵئاوایی لێکردین.

دوای مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەی ژیانم تەواو گۆڕا. لەناکاو هەستمکرد کات زۆر لەوە بەنرختره، کە تێیگەیشتبووم. تا ئەوکانەش مامەڵەکردنی من لەگەڵ کات وەک ئەوە وابوو ئاوێکی ڕوون و جوان بکەمە زێرابەوە، نەمدەتوانی بەخێرایی شتەکان بگەڕێنمەوە سەر باری ئاسایی خۆیان. ئیتر لەوەبەدوا لەیانە شەوانە چۆڵەکاندا پیانۆم نەژەنییەوە، وازم لە نووسینی شیعری گۆرانیش هێنا، ئەو شیعر و گۆرانیانەی کەس گوێی لێنەدەگرتن، پاشان دووبارە گەڕامەوە بۆ ژیانی خوێندکاریی. بڕوانامەی ماستەرم لەڕۆژنامەوانیدا بەدەستهێنا و یەکەم ئیش، کە پێشکەشمکرا قبوڵمکرد. بووم بە ڕۆژنامەنووسی وەرزشیی و لەجیاتی ئەوەی دوای ناوبانگی خۆم بکەوم، کەوتمە نووسین لەسەر ئەو وەرزشکارانەی بەدوای ناوبانگی خۆیانەوە بوون. وەک ڕۆژنامەنووسی سەربەخۆش بۆ هەندێک گۆڤار و ڕۆژنامە کارمدەکرد. شەو و ڕۆژ نەدەوەستام، کارکردنم سنووری نەبوو. بەیانیان هەڵدەستام، دەمووددانم دەشت، هەر بە جلی خەوەکەمەوە دەچوومە سەر ئامێری چاپکردنەکەم و دەستمدەکرد بە هەواڵ و ڕاپۆرتنووسین. مێردی پورم پێشتر کاری بۆ کۆمپانیایەک دەکرد و زۆریش ڕقی لەئیشەکەی بوو، من بەخۆمم دەگوت هەرچییەکم کردووە نابێت وەک ئەوم بەسەر بێت.

لەنێوان (فلۆریدا) و (نیویۆرک)دا دەهاتم و دەچووم. دواجار لە (دیترۆیت) ئیشێکم دەستکەوت و بووم بە ستوونووس لە (دەزگای دیترۆیت بۆ نووسین و بڵاوکردنەوە). خەڵکی دیترۆیت شێتانە حەزیان لە وەرزش بوو. شارەکە چەندین تیپی لێهاتووی

تۆپی پێ و باسکە و باڵە و هۆکی سەرسەهۆڵی تێدابوو. شتەکان لەوێ تاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ حەز و هیواکانی من دەهاتنەوە. ئەوەبوو تەنها بەنووسینی ستوونەوە نەوەستام و لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا توانیم هەندێک کتێبی وەرزشییش بنووسم، بەرنامەی ڕادیۆیی ئامادە و پێشکەش بکەم، جارجاریش لەسەر تەلەفیزیۆن دەربکەوم و ڕاوبۆچوونی خۆم لەسەر وەرزشکارە دەوڵەمەندەکان و ئەو پرۆگرامە وەرزشیانە بخەمەڕوو، کە لەقوتابخانە و زانکۆکاندا دەخوێندران. بەشێک بووم لەو میدیا وەرزشییەی ئێستا لە تەواوی وڵاتدا زۆر بەرەو پێش چووە و بینەرێکی زۆری هەیە. بەکورتییەکەی کەوتبوومە سەر پێی خۆم.

وازم لەخانوو بەکرێگرتن هێنا و کەوتمە خانوو کڕین. خانوویەکم کڕی، کە لەسەر گردێکی جوان و بەرز دروستکرابوو. سەیارەشم کڕی. پارەم خستە ئیشەوە و گرووپی کار و بەرهەمهێنانم دروستکرد. زۆر بەخێرایی دەچوومە پێشەوە و تەواو سەرقاڵ ببووم، هەر ئیشێکم بکردایە لە ساتی کۆتاییدا فریای دەکەوتم. بە پەلە پەل کارە ڕۆتینییەکانی ژیانمم ئەنجامدەدا و بەخێرایی سەیارەم لێدەخوڕی. پارەیەکەم پەیدا کرد، کە هەرگیز بەخەیاڵمدا نەهاتبوو پەیدای بکەم. دواتریش کچێکم ناسی بە ناوی (جانین). سەرەڕای ئەو ژیانە ئاڵۆزەم و ئەو هەموو هاتن و چوونانەم، جانین خۆشیویستم. دوای پەیوەندییەکی حەوت ساڵیی پێکەوە هاوسەرگیرییمان کرد. دوای یەک هەفتە لە ئاهەنگی گواستنەوەکەمان دووبارە گەڕامەوە سەر کار. بەخۆم و(جانین)یشم گوت، کە ڕۆژێک لەڕۆژان منداڵ دروست دەکەین و دەبین بەخێزانێکی گەورەتر. جانیین ئەوەی زۆر پێخۆشبوو، بەڵام ئەو ڕۆژە هەرگیز نەهات.

هەموو توانای خۆمم خستەکار بۆ بەدەستهێنانی شتی زیاتر،

چونکە پێموابوو هەتا زیاتر بەدەستبهێنم، دەتوانم باشتر کۆنترۆڵی شتەکانی ناو ژیانم بکەم. دەمویست پێش ئەوەی وەک مێردی پورم نەخۆش بکەوم و بمرم بەختەوەریی بەدەستبهێنم. هەرچەندە لە بیرکردنەوەی خۆمدا هەر لەسەرەتاوە مردنێکی لەوەی مێردی پورمم بۆخۆم دانابوو.

ئەی مۆریی لە کوێی ئەم هاوکێشانەدا بوو؟ ڕاستییەکەی جارجارە مۆریی دەهاتەوە بیرم. ئەو وانانەم بیردەکەوتەوە کە لەسەر «مرۆڤ بوون» و «تێکەڵ بوون لەگەڵ کەسانیتر»دا پێی گوتبووین، بەڵام ئەو بیرکردنەوانەم هەمیشە کەمیان دەخایاند و کاڵدەبوونەوە وەک ئەوەی بیرکردنەوەبن لەکەسێک، کە ئێستا لەو دونیا بژی.

لەماوەی ئەو ساڵانەدا هەر ئیمەیڵێکم لە (زانکۆی براندایس)ەوە بۆ دەهات دەستبەجێ دەمسڕییەوە، چونکە پێموابوو هەرچییەک لەوێوە بێت دواجار مەبەستەکەی پارە کێشانەوەیە. بەو هۆیەوە هەواڵی نەخۆشییەکەی مۆرییم نەزانی. ئەو کەسانەشی کە دەکرا ئەو هەواڵەم بدەنێ دەمێک بوو لەبیرم چووبوونەوە، ژمارە تەلەفۆنەکانیانم لە قوتویەکدا لە هەورەبانەکە فڕێدابوو. ئەگەر ئەو شەوە بە کەناڵەکانی تەلەفیزیۆندا نەگەڕامایە و گوێم لەوە نەبووایە، کە گوێم لێبوو، ڕەنگبوو تاهەتایە هیچ هەواڵێک لەسەر مۆریی نەبیستمەوە.

# بەرنامە تەلەفیزیۆنییەکە

ماڵی مۆریی لە شاری (نیۆتۆن)ی سەر بە ویلایەتی ماسەچوستس بوو. لەمانگی ئازاری ساڵی ۱۹۹۵ دا، لەبەردەمی ماڵی مۆریی، کە هەمووی بەفر بوو، (تێد کۆپێڵ) لەسەیارەیەکی لیمۆزین دابەزی. تێد پێشکەشکاری بەرنامەی (نایت لاین)ی بەناوبانگ بوو.

مۆریی ئەو کاتە بەردەوام دەبوو لەسەر عەرەبانە بێت، بەتەواوی ڕاهاتبوو لەگەڵ ئەوەی یارمەتیدەرەکانی هەڵیبگرن و بیخەنەسەر جێگاکەی و لەجێگاکەشیەوە بیخەنەوە سەر عەرەبانەکەی. لەکاتی خواردندا دەکۆکی، بەڵام پێویستیش بوو زۆر کات دەمی بجوڵێت. قاچەکانی بەتەواوی پەکیان کەوتبوو، ئیتر لەو کاتە بەدواوە بەپێی خۆی نەڕۆیشتەوە، بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هیچ کات ئامادە نەبوو خۆی بداتە دەست خەمۆکیی، بگرە ببووە چرایەکی ڕووناک و بەچواردەوری خۆیدا قسەی جوان و بەسوودی دەدایەوە.

مۆریی لەسەر پارچە کاغەزی زەردی بچووک، لەسەر بەرگی ئەو نامانەی بۆی دەهاتن، لەسەر فایل و کاغەزی بەکار هاتوو وتە و بۆچوونەکانی خۆی بەکورتی دەنووسییەوە. هەندێک وتەی کورتی فەلسەفیی نووسیبوون دەربارەی (ژیان لەژێر سێبەری مردندا)، بۆنموونە یەکێک لە وتەکان ئەمە بوو: تۆ هەندێک شتت پێدەکرێ و هەندێک شتیشت پێناکرێ، قبوڵی کە! لە وتەیەکی تردا دەیگوت:

رابــردووت وەک ئــەوەی هەیــە قبــوڵ بــێ، نــە نکوڵــی لێبکــە و نــە بەکەمیش لێی بڕوانـە. یـان: فێربـە چۆن لەخـۆت و کەسانیتر خۆش بیی. لەسـەر پارچە کاغەزێکی تریش نووسیبووی: وامەزانە درەنگە و کاتـی ئـەوەت نەمـاوە دەسـت بـەم شـتانە بکـەی!
پـاش ماوەیـەک مۆریـی نزیکـەی پەنجا دانـە لـەم وتـە کورتانەی نووسـی و لەگـەڵ هاوڕێـی و میوانەکانیـدا قسـەی لەسـەر دەکـردن. یەکێـک لەهاوڕێکانـی مۆریـی بەنـاوی (مـاوری ستەین)، کە ئەویش کاتـی خۆی مامۆستای زانکۆی براندایس بـوو، ئەوەنـدە سەرسامبوو بە وتەکانـی مۆریی، کە کۆپیکـردن و گەیاندنیـە دەسـت ڕۆژنامەنوسێکی ڕۆژنامـەی (بۆسـتن گلـەوب)، ڕۆژنامەنوسـەکەش هەواڵێکی درێـژی لەسـەر مۆریـی ئامادەکرد و ئـەم ناونیشـانەی بـۆ دانـا: مامۆسـتایەکی زانکـۆ کۆرسـێک لەسـەر مردنـی خـۆی دەڵێتـەوە.
دواتـر یەکێـک لـە بەرهەمهێنەرەکانـی بەرنامـەی نایـت لاین هەواڵەکـەی بینی و گەیاندیە واشـنتۆن. لـەوێ (تێد کۆپێـڵ)ی بینـی و داوایلێکـرد بخوێنێتـەوە. هـەر ئەوەندەمـان زانـی پـاش ماوەیەکـی کـەم کۆپێـڵ لەبـەردەم ماڵـی مۆریـی لـە لیمۆزینێـک دابـەزی و وێنەگـران خۆیـان کـرد بـە ژووردا.
ئەندامانـی خێزانەکـەی مۆریـی و زۆر لەهاوڕێکانـی هاتبـوون بـۆ ئـەوەی کۆپێـڵ ببینـن. کاتێـک کۆپێـڵ خـۆی کـرد بەماڵەکـەدا، هەموویـان، جگـە لـە مۆریـی، لەخۆشـییان کردیـان بـە هـاوار هـاوار. مۆریـی بەخـۆی عەرەبانەکەیـەوە هاتـە پێشـەوە و برۆکانـی بەرزکـردەوە، ئینجـا بەدەنگـە بەرزەکـەی هـاوار و دەنگەدەنگـەی کۆتایـی پێهێنـا. سـەرەتا مۆریـی بـە (تێـد)ی گـوت: تێـد دەبـێ یەکەمجار بۆخـۆم هەڵتبسـەنگێنم و بزانـم چیـت لەباردایـە؟
مۆریـی وایگـوت و بێدەنگییەکـی سـەیر باڵـی بەسـەر ژوورەکـەدا کێشـا.

ئینجا دوو پیاو پێش کۆپێڵ و هاوکارەکانی کەوتن و بردیانن بۆ ژووری میوان. دەرگا داخرا و کاتی چاوپێکەوتنەکە هات. یەکێک لەوانەی لەدەرەوە وەستابوون گوتی: هیوادارم تێد خراپ دانەبەزێتە سەر مۆریی.

یەکێکیتریان گوتی: من هیوادارم مۆریی خراپ دانەبەزێتە سەر تێد!
لەژوورەوە مۆریی هێمای بۆ تێد کرد دانیشێت. تێد دانیشت، هەردوو دەستی خستەسەر باوەشی و زەردەخەنەیەکی کرد. سەرەتا مۆریی دەستی بەقسە کرد: تێد، باسی شتێکم بۆ بکە، کە لەدڵتدا هەڵتگرتبێ و زۆرت خۆش بوێ.
تێد پرسیارەکەی مۆریی دووبارە کردەوە: شتێک لەناو دڵمدا هەڵمگرتبێ؟
کۆپێڵ کەمێک لە پیاوە پیرەکە وردبۆوە و گوتی: باشە، دۆزیمەوە! ئینجا کەوتە باسکردنی منداڵەکانی. تێد بەڕاستی منداڵەکانی لەناو دڵیدا هەڵگرتبوو، ئەی منداڵ خۆشەویستن، وانییە؟
مۆری گوتی: زۆر باشە، ئێستا دەربارەی بیروباوەڕت قسەم بۆ بکە.
ئەو پرسیارەی مۆریی هەستێکی ناخۆشی بۆ کۆپێڵ دروستکرد.
کۆپێڵ وەڵامی دایەوە: ئەگەر ڕاستت دەوێ حەزناکەم باسی شتی وا لەگەڵ کەسێکدا بکەم، کە هەمووی تۆزێکە ناسیوومە.
مۆریی لەودیو عەینەکەکەیەوە سەیرێکی (تێد)ی کرد و گوتی: تێد، من دەمرم، کاتم زۆر نەماوە لێرە، ها!
تێد پێکەنی و گوتی: باشە وەڵامت دەدەمەوە.
تێد چەند دێڕێکی (مارکۆس ئۆرلیاس)ی بەلەبەر گوت. مۆری سەرێکی بۆ لەقاند. تێد بەردەوامبوو: ئینجا با من پرسیارێک لە تۆ بکەم. تا ئێستا بەرنامەکەمت بینیوە؟
مۆریی شانێکی بەرزکردەوە و وەڵامی دایەوە: وابزانم دووجار

دووچار و بەسەر؟!

پێناخۆشی بەمن. بەرنامەکەی (ئۆپرا)م بەکحار بینیوە!

باشە ئەو دووچارەی بینیت چۆن بوو بەلاتەوە؟

مۆریی پێش ئەوەی وەلام بداتەوە لە (تێد)ی پرسی: دەتەوێ ڕاست وەلامت بدەمەوە؟

- بەڵێ

- بەڕاستی وەک کەسێک دەمبینیت، کە زۆر بەجوانییەکەی بنازێ.

تێد بەو قسەیەی مۆریی زۆر پێکەنی و گوتی: ئاخر ناشیرینێکی وەک من کەی هی ئەوەیە بەجوانییەوە بنازێ.

***

پاش کەمێک کامێراکان کەوتنە وێنەگرتنی کۆپێل و مۆریی. کۆپێل قاتێکی شینی لەبەردابوو، مۆریش بلوزێکی ڕەساسی فش. مۆریی ڕازی نەبیوو جلی کەشخە لەبەربکات و میکیاژی بۆ بکرێت بۆ چاوپێکەوتنەکە، چونکە پێیوابوو (مردن عەیبەی تێدا نییە) و پێویست ناکات خۆی لێ بدزێتەوە.

مۆریی لەبەرئەوەی لەسەر عەرەبانە بوو، کامێراکە قاچە سیس وشکبووەکانی نیشان نەدەدا، بەلام لەبەرئەوەی دەستەکانی هێشتا زیندوو بوون، هەرکاتێک قسەی بکردایە هەردووکیانی دەجولاند.

مۆریی زۆر بەکەیف خۆشییەوە باسی کۆتایی ژیان و ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ مردن دەکرد. بە تێدی گوت: تێد، یەکەمجار، کە توشی ئەم نەخۆشییە بووم، لەخۆمم پرسی: ئایا دەبێ لەم دونیایە و لەم ژیانە دووربکەومەوە، کە زۆر کەس ئەمە دەکەن، یان دەبێ هەوڵبدەم بەباشترین شێوە بەردەوامیی بەژیانی خۆم بدەم؟. بڕیارمدا دووەم هەڵبژێرم و بژیم، یان لانیکەم هەوڵبدەم بژیم بەوشێوەیەی دەمەوێت:

بەنەفس بەرزیی و ئازایی، بەدڵخۆشیی و ئارامیی.
مۆریی بەردەوامبوو: هەندێک بەیانی بۆ خۆم دەگریم، هەندێک بەیانی زۆر تورە و پەست دەبم، بەڵام هیچکام لەو هەستانە زۆر تیامدا نامێننەوە، بۆیە دواتر هەڵدەستم و بەخۆم دەڵێم: دەمەوێ بژیم. تا ئێستا توانیمە بەباشی ئەوە بکەم، بۆم دەچێتەسەر؟ نازانم. بەڵام گرەوم لەگەڵ خۆم کردووە، کە دەتوانم.
کۆپێڵ بەتەواوی چووبووە ناو قسەکانی مۆرییەوە. پرسیاری کرد چۆن مۆریی توانیویەتی لەماوەی ئەو نەخۆشییەیدا ئەو هەموو سادەیی و خاکیبوونە بدۆزێتەوە.
مۆریی وەڵامی دایەوە: فرێد گیان... ببورە تێد گیان.
کۆپێڵ قسەکەی پێبڕی و بەپێکەنینەوە گوتی: بۆ نموونە ئەو سادەییە.
مۆریی و تێد دووبەدوو کەوتنە باسکردنی دونیای دوای مردن. قسەیان لەسەر پێویستیی مۆریی بەکەسانیتر کرد. دەبێت بڵێم ئێستا جگە لەشتەکانیتر مۆریی بۆ دانیشتن و نانخواردن و ڕۆیشتن لە جێگەکەیەوە بۆ جێگەیەکیتر پێویستی بەیارمەتی کەسانی دیکە بوو. کۆپێڵ لە مۆریی پرسی کە لەم مردنە هێواش و ترسناکەیدا چ شتێک بەلایەوە لەهەموو شتەکانیتر ناخۆشترە. مۆریی کەمێک وەستا و ئینجا گوتی: ئاساییە وەڵامەکەم لەبەردەم کامێرادا بڵێم؟
- بێگومان
مۆریی بەدەم سەیرکردنی ناوچاوی بەناوبانگترین پێشکەشکاری ئەمەریکاوە گوتی: ناخۆشترین شتی نەخۆشییەکەم ئەوەیە دوای ماوەیەکیتر دەبێ یەکێک قنم بۆ پاک بکاتەوە.

***

چاوپێکەوتنەکە شەوی هەینی دابەزی. سەرەتا لە (واشنتۆن)ەوە تێد لەپشت مێزەکەیەوە دەرکەوت و بەدەنگێکی بەهێز و پڕ بڕوا بەخۆبوونەوە دەستیپێکرد: مۆریی شوارتز کێیە؟ ئەی بۆچی دوای تەواوبوونی ئەم بەرنامەیە زۆربەتان بەگرنگییەکی زۆرەوە لەو پیاوە دەڕوانن؟

لەدووری هەزاران میلەوە لەماڵەکەی خۆم لەسەر گردەکە بەدیار تەلەفیزیۆنەوە دانیشتبووم و خێرا خێرا کەناڵەکانم دەگۆڕی. هەر کە لەموکەبەرەکانەوە گوێم لەو وشانەی کۆپێل بوو: مۆریی شوارتز کێیە؟... لەجێی خۆم سڕ بووم.

***

بەهاری ساڵی ١٩٧٦ ە و یەکەم وانەی کۆرسەکەمانە لەگەڵ مۆریی. دەرۆمە ژوورە گەورەکەی و دەبینم ژمارەیەکی ئێجگار زۆر کتێب لەسەر ڕەفەی کتێبخانەکە ڕیز کراون. کتێبەکان بەزۆری لەسەر کۆمەڵناسیی و فەلسەفە و ئایینەکان و سایکۆلۆژیان. لەسەر زەوی ژوورەکە، کە تەختەیە، پارچە فەرشێکی گەورە ڕاخراوە و پەنجەرەکە بەسەر یەکێک لەباخچەکانی زانکۆدا کراوەتەوە. هەمووی دە، دوانزە خوێندکار هاتوون و پێکەوە لەیەککاتدا خەریکی دەرهێنانی دەفتەرەکانیانن. زۆربەیان کابۆ و کراسی خەت چوارگۆشەی کەتانیان لەبەرە و پێلاوی تەختیان لەپێیە. بەخۆم دەڵێم: کۆرسێک ئەمە ژمارەی خوێندکارەکانی بێ دیارە ئاسان نییە. وا باشە وەرینەگرم و بیگۆڕم بە دانەیەکیتر.

مۆریی لیستی ناوەکان دەخوێنێتەوە و دەگاتە ناوی من: میشێل؟

دەستم بەرز دەکەمەوە.

– حەز دەکەیت بە (میچ) بانگت بکەم، یان هەر (میشێل) ەکە بێ؟

پێشتر هیچ مامۆستایەک ئەو پرسیارەی لێنەکردووم. بۆ ساتێک لە مۆریی ڕادەمێنم، بلوزێکی ملداری زەرد و پانتۆڵێکی سەوزی قەیفەی لەبەردایە و قژە زیویەکەشی هاتۆتە سەر ناوچاوانی. بەزەردەخەنەیەکەوە لەسەر دەموچاوی چاوەڕێی وەڵامم لێدەکات.

وەڵام دەدەمەوە:(میچ)ە کە زۆر باشە. هاوڕێکانیشم هەر وا بانگم دەکەن.

ــ کەواتە لەسەر (میچ) ڕێککەوتین.

مۆریی بەشێوەیەک قسەکە دەکات وەک ئەوەی مشتومڕی ڕێککەوتنێکی گەورەمان کۆتایی پێهێنابێت.

سەیرێکی لیستەکە دەکاتەوە و دەڵێت: یەک شتی تریش، میچ؟

ــ بەڵێ؟

ــ هیوادارم ڕۆژێک منیش وەک هاوڕێی خۆت سەیر بکەی.

# کۆرسەکە

ئەوکاتەی بەخۆم و سەیارەکەمەوە خۆم کرد بەو شەقامەدا، کە دەچووە سەر ماڵی مۆریی، بەدەستێکم پەرداخێک قاوەم پێبوو بەدەستێکیش سوکانەکەم گرتبوو، مۆبایلێکیش لەنێوان گوێچکە و شانمدا بوو. قسەم لەگەڵ بەرهەمهێنەرێکی تەلەفیزیۆنیدا دەکرد دەربارەی کارێک، کە پێکەوە خەریکی ئەنجامدانی بووین. سەیرێکی سەعاتی سەر داشبۆڵی سەیارەکەم کرد: کاتی گەڕانەوە و گەشتە ئاسمانییەکەم بۆ دیترۆیت نزیک ببۆوە. ئینجا سەیرێکی ژمارەی دوو، سێ خانووی سەر شەقامەکەم کرد، کە لەسەرەتاکەیەوە تا کۆتاییەکەی ئەمبەر و ئەوبەر بەڕیز درەخت نێژرابوون. ڕادیۆکەشم لەسەر کەناڵی هەواڵەکان دانابوو. ئیتر لەو ماوەیەدا بەوشێوەیە دەژیام، چوار پێنج ئیشم لەیەککاتدا دەکرد.

بەبەرهەمهێنەرە تەلەفیزیۆنییەکەم گوت: شریتەکە تۆزێک بگەڕێننەوە دواوە. با گوێم لەو قسە ببێتەوە.

وەڵامی دامەوە: یەک دەقە چاوەڕێکە.

ئەوەندەم زانی گەیشتمە بەردەم ماڵی مۆریی. ئیستۆپێکی قایمم گرت و قاوەکە بە کۆشمدا ڕژا. خێرا سەیارەکەم وەستاند، ئینجا چاوم چووە سەر دارێکی گەورەی گەڵاسوور کە لەحەشەوی دەرەوەی ماڵی مۆرییدا ڕووێنرابوو، لەژێر دارەکەدا سێ کەس وەستابوون:

کوڕێکی گەنج، ژنێکی تەمەن مامناوەندو پیاوێکی پیری بچووک، کە لەسەر عەرەبانەیەک دانیشتبوو: مۆریی!

بەبینینی مامۆستا کۆنەکەم لەجێگەی خۆم وشک بووم. کابرای بەرهەمهێنەر هەر دەیگوت: ئەلو؟ ئەلو؟ گوێت لێمە؟

شانزە ساڵ بوو (مۆریی)م نەبینیبوو. قژی تەنک و ماشوبرنجیی ببوو. دەموچاویشی زۆر لاواز بوو. لەناکاو هەرلەخۆمەوە هەستمکرد لەناخەوە ئامادەنیم بۆ ئەم یەکتر بینینەوەیە، کە دوای ئەو ماوە زۆرە لەدابڕان ڕوودەدات. مێشکم هەرلای پەیوەندییە تەلەفۆنییەکەم بوو. هیوام دەخواست مۆریی نەیبینیبێم بۆ ئەوەی بڕۆم، هەم نیشەکەم تەواو بکەم، هەم لەڕووی دەروونیشەوە خۆم ئامادە بکەم بۆ بینینەوەی مامۆستا کۆنەم، بەڵام مۆریی، ئەو پیاوەی جاران زۆر باش دەمناسی و ئێستا خەریکوو سیس دەبوو، سەیری سەیارەکەی کردم و زەردەخەنەیەکی کرد. هەردوو دەستی خستبووە سەر باوەشی و چاوەڕێی دەکرد دابەزم. ئەو کابرایەی بە تەلەفۆنیش لەگەڵم بوو دووبارە هاواری لێکردمەوە: هێی! گوێت لێمە؟

وەک وەفایەک بۆ هەموو ئەو ساتە جوانانەی لەگەڵ مۆریی بەسەرم بردبوون، هەروەها بۆ ئەو هەموو ئارامگرییەی مۆریی لەڕۆژانی گەنجێتی و زانکۆمدا لەگەڵم نواندبووی، دەبوو هەر کە گەیشتمە بەردەمماڵیان یەکسەر تەلەفۆنەکە دابخەمەوە، دابەزم و بەرەو پیری مۆریی بڕۆم و باوەشی پێدابکەم، بەڵام لەجیاتی ئەوە سەیارەکەم کوژاندەوە و خۆم نوشتاندەوە وەک ئەوەی بۆ شتێک بگەڕێم.

بەچرپە بەکابرای سەر تەلەفۆنەکەم گوت: ئا، ئا گوێم لێتە. بەردەوامبووین لەسەر گفتوگۆکەمان تا ئیشەکەمان تەواوکرد، ئەمە لەکاتێکدا مامۆستا کۆنەکەم لەبەردەگای ماڵەکەی چاوەڕێی دەکرد

لەسەیارەکەم دابەزم و بچم بۆلای. بەڕاستی هیچ شانازییەک بەدەوو ناکەم، بەڵام دەبێت دانی پێدابنێم ئەمە ئەوەبوو، کە ڕوویدا.



دوای پێنج خولەک، گەیشتمە ناو باوەشی مۆریی و هەستم بە قژە تەنکەکەی کرد لەسەر ڕوومەتەکانم. پێمگوت کە سوریچەکەم لێبەرببووەوە و بۆی دەگەڕام بۆیە وا درەنگ دابەزیم. وامگوت و توندتر باوەشم پێداکرد وەک ئەوەی ئەو باوەشە توندە درۆکەم بسڕێتەوە.

هەرچەندە هەتاوە بەهارییەکەی گەرم بوو، مۆریی بلوزێکی ئەستووری لەبەردابوو، بەتانییەکیش قاچەکانی داپۆشیبوو. مۆریی بۆنێکی تیژی لێوە دەهات، کە ئاشکرابوو بۆنی حەب و دەرمانە. هەر لەباوەشەکەماندا کاتێک دەموچاوم بە دەموچاویەوە دەنووسا، گوێم لە دەنگی هەناسەکانیشی دەبوو.

مۆریی بەچرپە پێیگوتم: دۆستی کۆنی ئازیز، لەکۆتاییدا هاتیتەوە بۆ لام.

مۆریی نەیدەهێشت بێمە دەرەوە لەباوەشی. من چەمابوومەوە بەسەریدا و ئەویش دەستەکانی تا ئانیشکەکانم هاتبوون. دوای شانزە ساڵ لەیەکتر نەبینین و دووریی، ئەو هەموو خۆشەویستیی و نزیکییەی مۆریی بۆ من جێگەی سەرسامی بوو. هەڵبەتە کێشەکە لەمندا بوو، کە لەنێوان ڕابردو و ئێستامدا دیوارێکی ئەوەندە ئەستوورم دروستکردبوو، کە بیرم چووبۆوە کاتی خۆی من و مۆریی چەند لەیەکتر نزیک بووین. ڕۆژی ئاهەنگی دەرچوونەکەمم بیرکەوتەوە، جانتاکەی کە بەدیاری پێمدا، فرمێسکەکانی کاتێک جیابووینەوە، بەڵام هەموو ئەوانەم بەخێرایی لە بیری خۆم دەرکرد.

چونکە دەمزانی من چیتر ئەو خوێندکارە باشەی جاران نەمابووم، کە مۆریی لە بیری خۆیدا هەڵیگرتبوو. لەوکاتەدا تەنها هیوای ئەوەم دەخواست بتوانم بۆ ئەو یەک دوو کاتژمێرەی بەیەکەوە دەبین بەجۆرێک قسە و هەڵسوکەوت بکەم فریوی بدەم و وابزانێت هەر کورەکەی جارانم.

چوینە ژوورەوە و لەسەر مێزی ژووری نانخواردنەکە، کە لەداری گوێز دروستکرابوو، دانیشتین. پەنجەرەی ژوورەکە بەسەر حەوشەیماڵەکەی تەنیشتیاندا دەیڕوانی. مۆریی هەر لەگەڵ عەرەبانەکەی خەریک بوو، دەیویست تەواو ئاسوودە لەناویدا دانیشێت. وەکو خووی هەمیشەیی خۆی، داوای لێکردم لای ئەو نان بخۆم و منیش قبوڵمکرد. یەکێک لە یارمەتیدەرەکانی مۆریی کە ژنێکی کەڵەگەتی ئیتاڵی بوو بەناوی (کۆنیی)، نان و تەماتەی لەتکرد و لەگەڵ زەڵاتەی مریشک و حومس و تەپولە هێنای لەبەردەممان داینا، هەندێک حەبیشی هێنا. مۆریی سەیرێکی حەبەکانی کرد و ئاهێکی هەڵکێشا. بیرم لەڕووخساری جارانی کردەوە و درکم بەوەکرد، کە چاوەکانی لەجاران زیاتر بەناودا چووبوون، ئێسقانەکانی سەر ڕوومەتیشی دەرپەڕیبوون، ئەوەش وایدەکرد ڕووخساری تووڕە و پیرتر دیاربێت، بەتایبەت کاتێک، کە پێنەدەکەنی. بەڵام لەگەڵ پێکەنینەکەیدا ڕوومەتەکانی وەک پەردە لادەدران و ڕووخساری شێوەیەکی تری وەردەگرت.

مۆریی لەسەرخۆ گوتی: میچ، ئەرێ زانیوتە دەمرم؟

- زانیومە

- زۆر باشە.

مۆریی حەبەکانی قوتدا و پەرداخەکەی دانایەوە، ئینجا هەناسەکی قووڵی هەڵمژی و دایەوە: حەزدەکەی پێتبڵێم چۆنە؟

- چی چۆنە؟ ئەوەی کە بزانی دەمری؟
- بەڵێ
بەبێ ئـەوەی خـۆم پێـی بزانـم دوا کۆرسـی مـن و مۆریـی پێکـەوە دەسـتیپێکردبوو.

*** 

یەکەم ساڵی زانکۆمە. مۆریی لەزۆربەی مامۆستاکانم گەورەترە و منیش، لەبەر ئەوەی یەک ساڵ زووتر لە ئامادەیی دەرچووم، لە زۆربەی خوێندکارەکان بچووکترم. بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو ساڵە لە ڕووخسارمدا، کراس و بلوزی کۆنی ڕەساسی لەبەردەکەم و لە هۆڵێکی وەرزشی دەستمکردووە بەیاری بۆکسێن. هەرچەندە جگەرەش ناکێشم، بەڵام زۆربەی کات جگەرەیەکی هەڵنەکراوم بەدەمەوەیە. قەمەرەیەکی (مێرکوری)شم پێیە، کە بەردەوام جامەکانی دادراونەوە و گۆرانی بەدەنگی بەرز ئیش دەکات. دەمەوێت لەڕێی مامەڵەکردنی ڕەقەوە کەسایەتی خۆم بدۆزمەوە، بەڵام ئەو لەسەرخۆیی و مامەڵە نەرمەی مۆریی ڕامدەکێشێت و کارم تێدەکات. دڵخۆشم بەوەی مۆریی وەکو منداڵ لێم ناڕوانێت.

ئەو کۆرسە لەگەڵ مۆریی تەواو دەکەم و خۆم ناونووس دەکەم لە کۆرسێکی تریشیدا. مۆریی لە نمرەدانانـدا دڵی باشە و زۆر گرنگی بە نمرە نادات. دەڵێن ساڵێکیان لەماوەی ساڵانی (جەنگی ڤێتنام)دا لە نەوەد کەمتری بۆ هیچ خوێندکارێکی کوڕ دانەناوە، تەنها بۆ ئەوەی بەسەرباز نەیانگرن.

بەیادی ڕاهێنەرەکەی قۆناغی ئامادەییمەوە، هەر لەسەرەتاوە مۆریی بە(ڕاهێنەر) بانگدەکەم. ئەویش نازناوەکەی بەدڵە.

- میچ، ئیتر پێمدەڵێیت «ڕاهێنەر». دەبم بەڕاهێنەرت، تۆش دەتوانی ببی بە یاریزانم. ئەو یارییە خۆشانەت فێردەکەم،

کە تەمەن چیتر ڕێگە بە من نادا بیانکەم.

هەندێکجار پێکەوە لەکافتریا نان دەخۆین. لەبەختی من (مۆریی)ش وەکو خۆم سادەیە و گوێ بەزۆر شت نادات. لەکاتی شت خواردندا قسە دەکات، لەکاتی پێکەنیندا دەمی دەکاتەوە، جاری وا هەیە، دەمی پڕە لەزەڵاتەی هێلکە و لەسەر بابەتی گرنگ بۆچوونی خۆی دەردەبڕێت، ئینجا لەنێوان ددانەکانییەوە پارچەی بچووک لە زەڵاتەکە دەردەپەڕنەدەرێ. هەموو جارێک کە ئەوە ڕوودەدات زۆر پێدەکەنم. لەهەموو ئەو ماوەیەدا، کە مۆرییم ناسیووە هیوایەتم دوو شت بووە لەگەڵی: باوەشی پێدا بکەم و دەستەسڕی بدەمێ.

# هۆڵی وانە خوێندنەکەمان

تیشکی خۆر لەپەنجەرەکەوە دەهاتە ناو ژووری نانخواردنەکەوە و زەوییەکە، کە لەتەختە دروستکرابوو، بریقەی دەدایەوە. نزیکەی دوو کاتژمێر بوو لەوێ قسەماندەکرد. زەنگی تەلەفۆن لێیدا و مۆریی داوای لە کۆنیی کرد وەڵامبداتەوە. هەر کەسێک تەلەفۆنی بکرادایە کۆنیی ناوەکەی لەو دەفتەرە بچووکەدا دەنووسی، کە بۆ ناوی سەردانکەرەکان دایانابوو. لەناو ئەو کەسانەشدا، کە دەهاتن بۆلای مۆریی، هاورێی تێدابوو، مامۆستای ڕۆحیی تێدابوو، تێیاندابوو داوای دەکرد گرووپی گفتوگۆ لەگەڵ مۆریی دروست بکات، هەبوو دەیویست بێت و هەندێک وێنەی مۆریی بگرێت بۆ گۆڤارێک یان بڵاوکراوەیەک. تەنیا من نەبووم، کە پێمخۆش بوو سەردانی مامۆستا کۆنەکەم بکەم. ئەو بەرنامەیەی تێد کۆپێڵ، مۆریی وەک ئەکتەرەکان بەناوبانگ کردبوو، بەڵام ئەوەی من پێی سەرسامبووم و کەمێکیش ئیرەیی تێدا دروست کردبووم بەرامبەر مۆریی ئەو هەموو هاورێیانە بوون، کە مۆریی هەیبوون. بیرم لە هاورێکانی سەردەمی زانکۆم دەکردەوە و لەخۆم دەپرسی: ئەی باشە هاورێکانی من چییان لێهات؟ بۆ کوێ چوون؟

– میچ، دەزانی لەوەتەی ئاشکرابووە دەمرم، زۆر خۆشەویست بووم.

- تۆ هەمیشە خۆشەویست بووی.

مۆریی بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی: تۆوو! میچ، تۆ زۆر میهرەبانی.

بیرێکی خێرام لەخۆم کردەوە و لەدڵی خۆمدا گوتم: نەوەڵا میچ میهرەبان نیم. میهرەبانی چی!

مۆریی کەوتەوە قسە: مەسەلەکە ئەوەیە خەڵک وەکو پردێک سەیری من دەکەن. نە ئەوەیە وەک جاران چالاک و زیندوو بم، نە ئەوەشە مردبم. لەنێوان هەر دووکیاندام.

ئینجا کۆکی و دیسان زەردەخەنەکەی خستەوە سەر دەموچاوی: ئێستا من لە دوا گەشت و گرنگترین گەشتی خۆمدام، خەڵکیش دێن و دەیانەوێ پێیانبڵێم چی بپێچنەوە بۆ گەشتەکەی خۆیان.

زەنگی تەلەفۆنەکە لێیدایەوە.

کۆنیی سەیرێکی مۆریی کرد و لێی پرسی: دەتوانی قسە بکەی؟

مۆریی وەڵامی دایەوە: ئێستا ئەم هاوڕێ کۆنەمم لایە. هەرکەسێکە بڵێ دوایی تەلەفۆن بکاتەوە.

سەرم لەو پێشوازییە گەرمەی مۆریی سوڕمابوو. ئێستا من ئەو خوێندکارە نەمابووم، کە ئەو پێش شانزە ساڵ ناسیبووی. خۆ ئەگەر بەرنامەی (نایت لاین) نەبووایە، لەوانەبوو جارێکیتر هەر نەیبینمەوە. هیچ پاساوێکی قبوڵکراویشم بۆ ئەوە پێنەبوو جگە لەو پاساوانەی هەموو کەسێک لەئێستادا دەیانهێنێتەوە: شتی زۆر هاتبوونە ناو ژیانمەوە، ئیشوکارم زۆر بوو، زۆر سەرقاڵبووم....

بەخۆمم گوت: ئەی هاوار میچ، تۆ بۆ وات لێهاتووە؟

دەنگە بەرزەکەی مۆریی گەڕاندمیەوە بۆ ساڵانی خوێندنی زانکۆم، ئەو کاتەی پێموابوو هەموو دەوڵەمەندەکان خراپن، چاکەت و پانتۆڵ و بۆینباخ زیندانن، ژیانێک تیایدا بەئارەزووی خۆت و بە ماتۆڕێکی باشی خۆت نەگەڕێیت و لە (پاریس)ەوە بۆی نەڕۆی بۆ

چیاکانی تبت، هەر ژیان نییە. باشە من بۆ ئەوەم لێدەرچووبوو؟
سالآنی هەشتاکان هاتن و تێپەڕین، نەوەدەکان هاتن و تێپەڕین، مردن و نەخۆشی و قەڵەویی و قژ ڕووتانەوە بەرۆکیان گرتم، بەبێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێت چەندین خەونی خۆم تالآنفرۆشکرد تەنیا لەپێناوی ئەوەدا پارەیەکی زیاتر پەیدا بکەم، کەچی هێشتا مۆریی بەهەمانشێوەی ڕۆژانی کۆلێژ لەگەڵم دەدوا، وەک ئەوەی من هەر وەک خۆم بم و تازە لە پشوویەکی درێژ گەڕابێتمەوە.
لێی پرسیم: کەست دۆزیوەتەوە نهێنییەکانی دڵتی لەگەڵ بەش بکەی؟ ئەی لەگەڵ خزمەتکردنی خێزان و کۆمەڵگاکەت چۆنی؟ ئەی تۆ پێمبڵێ لەگەڵ خۆت ئاشت و ئارامی؟ هەوڵتداوە چەند دەتوانی مرۆڤ بی؟
لەسەر کورسییەکەم هەر جووڵە جووڵم بوو، دەمویست وانیشان بدەم، کە دەمێکە گیرۆدەی ئەو پرسیارانە و وەڵامەکانیانم. خۆشم نازانم چیم بەسەرهات و چۆن بەسەرم هات؟ بیرمە جارێک بەڵێنم بەخۆمدا هەرگیز تەنها بۆ پارە کار نەکەم، بەڵێنمدا بچمە گروپی (فەراهەمهێنەرانی ئاشتی)یەوە، لەشوێنی جوان و باش بژیم، کە یارمەتی لایەنی ڕۆحییم بدەن، بەڵام لەجیاتی ئەوانە ئەوە ماوەی دە ساڵ بوو کەوتبوومە دیترۆیت. تەواوی ئەو ماوەیەش لەیەک شوێن کارم دەکرد، یەک بانکم بەکاردەهێنا و لای هەمان سەرتاش سەرم چاکدەکرد. تەمەنم گەیشتبووە سی و حەوت ساڵ و زۆر لەساڵانی کۆلێژ پێگەیشتووتر بووم، بەڵام هەمیشە بە کۆمپیوتەر و تەلەفۆنەکەمەوە نووسابووم. بابەتم لەسەر ئەو وەرزشکارە دەوڵەمەندانە دەنووسی، کە هەر گرنگییشیان بەکەسێکی وەک من نەدەدا. لەتەمەنی هاوڕێکانمدا نەمابووم، چیتر بە بلوزی ڕەساسی و جگەرەی هەڵنەکراوەوە نەدەگەڕام، ئێستا ئیتر بەدەم خواردنی

زەلاتـەی هێلکـەوە گفتوگـۆم لەسـەر مانـای ژیـان نەدەکـرد!

ڕۆژەکانـم پڕبـوون لـە ئیش و کار، لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆربـەی کات نـاڕازی بـووم. باشـە بەڕاسـت مـن بـۆ وام لێهاتبـوو؟!

نازناوەکەم بیرکەوتەوە و لەپڕ بانگی مۆرییم کرد: ڕاهێنەر؟

مۆریـی کـە گوێـی لـە وشـەکە بـوو، دەموچـاوی گەشـایەوە و خێـرا وەڵامـی دامـەوە: منـم، ڕاهێنـەر منـم! میـچ، ئێسـتاش هەر مـن ڕاهێنەرتم ها !

پێکەنـی و لەسـەر نانخواردنەکـەی بەردەوامبـوو، کـە چـل خولـەک بـوو دەسـتیپێکردبوو. بـەوردی سـەیرمدەکرد و دەمبینـی زۆر بەهێمنـی دەستەکانی دەجوڵێنێت وەک ئەوەی یەکەمجار بێت فێری بەکارهێنانیان ببێـت. بـۆ شـت بڕیـن نەیدەتوانـی بەهێزێکـی زۆرەوە دەست لەسـەر چەقۆکـەی دابگرێـت. پەنجەکانـی دەلەرزیـن. خواردنـی هـەر پارووپـەک ئیشێکی قـورس بـوو بـۆی. پێش ئـەوەی پاروەکـەی قوتبـدات، بەباشی دەیجوو، بـەڵام هەندێکجار لەقەراغـی لێوەکانییەوە کەمێـک لەخواردنەکە دەهاتـەدەر، بۆیـە ناچاردەبـوو ئـەوەی بەدەسـتییەوەیەتی داینێـت و دەستەسڕەکەی هەڵبگرێـت و دەمـی بسـڕێت. پێسـتی پشتەدەستەکانی وەک پێسـتە مریشـک بەئێسـقانەکەیەوە چـرچ و شـل ببـوو، یەکپارچەش پەڵـەی پیریـی لەسـەریان دەرکەوتبـوو.

بۆماوەیـەک بەوشـێوەیە بەردەوامبوویـن لەنانخـواردن: پیرەمێردێکی نەخۆش و گەنجێکی لەشساغ. هـەردوو پێکـەوە لەبێدەنگـی ژوورەکەدا نوقـم ببوویـن، بێدەنگییـەک، کـە وا لـە مـرۆڤ دەکات شـەرم بـکات، بـەڵام وادیاربـوو لەوێدا تەنهـا کەسێک کـە شـەرمی دەکـرد مـن بـووم!

مۆریـی بێدەنگییەکـەی شـکاند: میـچ! ئاساییە مـرۆڤ دڵتەنـگ بێ بـەوەی کـە دەزانـێ دەمرێ، بـەڵام کێشـەکە ئەوەیـە هـەر لەبنەڕەتـەوە ژیانـت بـە دڵتەنگییـەوە بەسـەربەری. تـۆ دەزانـی زۆربـەی ئەو کەسانەی

سەردانی من دەکەن دڵخۆش نین!

- بۆ؟

- وەڵامەکەی ڕوونە: ئەو کولتوورەی ئێمە هەمانە و لەسەری گەورەبووین وا لەخەڵک ناکات لەبەرامبەر خۆیاندا هەستی باش و دروستکەریان هەبێ. کێشەکە ئەوەیە ئێمە شتە هەڵەکان فێری یەکتر دەکەین. بۆیە دەبێ ئەوەندە بەهێز بی، کە ئەگەر کولتوورەکەت بەکەڵکت نەهات قبوڵت نەبێ و کولتوورێکی تازە بۆ خۆت دروست بکەی. زۆرکەس ئەوەیان پێناکرێ لەبەرئەوەیە دەیانبینی هێندەی منێکی نیوەمردوو دڵخۆش نین. میچ، ڕاستە ڕەنگە من بەمزووانە بمرم، بەڵام هەرچواردەورم مرۆڤی خۆشەویست و گرنگیپێدەرن. کەمن ئەوانەی وەک من ئەو بەختەیان هەیە؟

سەرمسوڕمابوو لەوەی مۆریی بەهیچ شێوەیەک کەمترین بەزەییشی بەخۆیدا نەدەهاتەوە. ئەو مۆرییەی کە چیتر نەیدەتوانی سەما بکات، مەلە بکات، خۆی بشوات، پیاسە بکات، تەنانەت دەرگای ماڵەکەی خۆشی بکاتەوە، دوای خۆشتن خۆی وشک بکاتەوە، یان تەنانەت ئەمدیوو ئەودیوویش بکات لەسەر جێگاکەی، ئێستا چۆن دەیتوانی ئەو دۆخانە ئاوا بە هێمنییەوە قبوڵ بکات؟ بەچاوی خۆم دەمبینی، کە تەنانەت ناتوانێت بەباشی چەتاڵەتەکەشی بەکاربهێنێت، لەپارچە تەماتەیەکی دەدا و بە دوو، سێ جار ئینجا هەڵیدەگرت. ئەوە دیمەنێکی زۆر خەفەتهێن بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمدەتوانی نکووڵی لەوە بکەم، کە دانیشتن لەگەڵ مۆریی ئارامییەکی سەیری پێدەبەخشیم، هەمان ئەو ئارامییەی لەڕۆژانی زانکۆدا هەستم پێدەکرد.

بەتیلەی چاو سەیرێکی سەعاتەکەم کرد: خەریکبوو درەنگ دەبوو. بیرم لەوەکردەوە کاتی گەڕانەوەم دوابخەم. لەم ساتەدا بوو

مۆریی شتێکی گوت، کە تا ئەمڕۆش وەک خۆی بیرمە و بەردەوام لەمێشکمدا دووبارە دەبێتەوە:

مۆریی گوتی: میچ، دەزانی چۆن دەمرم؟

بەسەرسوڕماوییەوە هەردوو برۆم بەرزکردەوە.

- دەخنکێم. ئا، ئا دەخنکێم. من چونکە ڕەبۆمە، سییەکانم ناتوانن زۆر بەرگەی نەخۆشییەکە بگرن و وردە وردە بەلەشمدا سەردەکەوێ، مەبەستم (ئەی ئێڵ ئێس)ەکەیە. ئەوە ئێستا لەقاچەکانمی داوە، بەمزووانەش دەگاتە دەست و قۆڵم، کە گەیشتیشە سییەکانم... ( وەستا و شانێکی بەرزکردەوە)، بۆ خۆم نوقم دەبم و ئەهـ.

نەمدەزانی چی بڵێم، هەر لەخۆمە گوتم: خۆی دەزانی چۆنە مۆریی گیان، مەبەستم ئەوەیە، مرۆڤ ناتوانێ لەو شتانە دڵنیا بێ.

مۆریی چاوەکانی داخست: دەزانم میچ! پێویست ناکات لە مردنەکەم بترسی و بۆم نیگەران بی. ژیانێکی باش ژیاوم. هەمووشمان دەزانین مردن لەڕێمانە. هەمووی ڕەنگە چوار، پێنج مانگێکم مابێ لێرە.

قسەکەم پێبڕی و بەشڵەژاوییەوە پێمگوت: دە نا ماڵئاوەدان! کێ دەتوانێ پێشبینی وا بکات.

بە لەسەرخۆییەوە گوتی: من دەتوانم! تەنانەت دکتۆرەکەم شتێکیشی فێرکردم بۆ ئەوەی حسابی بکەم چەندم ماوە.

- شتی وەک چی؟

مۆریی داوای لێکردم هەناسەیەکی قووڵ هەڵبمژم و منیش چۆنی گوت وامکرد.

- ئێستا هەناسەیەکیتر هەڵمژە، بەڵام ئەمجارە لەگەڵ هەناسەدانەوەکەتدا لە یەکەوە تا چەند دەتوانی بژمێرە.

ژمارەکان بەخێرایی لەدەممەوە هاتنەدەرەوە: یەک، دوو، سێ،

چوار، پێنج، شەش، حەوت، هەشت، ... گەیشتمە حەفتا و وەستام.

مۆریی گوتی: زۆرباشە میچ، مانای وایە سییەکانت ساغن. ئێستا سەیری من بکە.

مۆریی هەناسەیەکی هەڵمژی و بەدەنگێکی نەرم دەستیکرد بە ژماردن: یەک، دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش، حەوت، هەشت، نۆ، دە، یانزە، دوانزە، سیانزە، چواردە، پانزە، شانزە، حەڤدە، هەژدە.

لە هەژدەدا وەستا و هەناسەیەکی تری هەڵمژی.

- یەکەمجار کە دکتۆر داوای لێکردم ئەمە بکەم، دەگەیشتمە بیست و سێ، ئێستا لەهەژدە سەرناکەوم.

چاوی نوقاند و بەسەر لەقاندنەوە گوتی: بەخوا وابزانم تەنکییەکەم خەریکە خاڵی دەبێتەوە.

بەنیگەرانییەوە هەردوو دەستم بەڕانم دادا. بۆ دوانیوەڕۆیەک ئەوەندە بەس بوو.

کاتێک بۆ ماڵئاواییکردن باوەشم پێداکرد، پێیگوتم: وەرەوە و مامۆستا کۆنەکەت ببینەرەوە.

منیش بەڵێنم پێدا کەسەردانی بکەمەوە، بەلام بەبێ ئەوەی بیر لە دواجار بکەمەوە، کە بەڵێنی دانەبڕانم پێدابوو.

***

لەیەکێک لـە کتێبخانەکانـی نـاو زانکـۆدا بـۆ ئـەو کتێبانـە دەگەڕێـم، کـە دەبێـت بـۆ کۆرسـەکەی مۆریـی بیانکـڕم. هەندێک کتێـب دەکـڕم، کـە هەرگیـز نەمزانیـوە هـەن. ناونیشـانی سـەیریان هەیـە، بـۆ نموونـە: (گەنجێتـی: ناسـنامە و قەیـران)، (مـن و تـۆ)، (خـوودی پەرتـەوازە) و هتـد.

پێـش ئـەوەی بچمـە زانکـۆ نەمدەزانـی پەیوەندیـی نێـوان مرۆڤەکانیـش وەک بابەتێکـی زانسـتیی ئەژمـار دەکرێـت. تـا ئەوکاتـەش کـە (مۆریـی)م بینـی بـاوەڕم نەدەکـرد وابێـت.

ئارەزووی مۆریی بۆ کتێب ڕاستەقینە و درمـە. هەندێکجار دوای وانەکە کاتێک هۆڵەکە چـۆڵ دەبێـت زۆر بەجـددی دەکەوینە قسە. لەسـەر ژیانم پرسیارم لێدەکات و وتـەی (ئەریـک فـرۆم) و (مارتن بوبـەر) و (ئێریـک ئێریکسـۆن)م بـۆ دەهێنێتـەوە. زۆرجـار لەگـەڵ قسـەی ئـەو کەسـانەدا نییـە بۆیـە دواتـر بەجیـا ئامـۆژگاری خۆیـم دەداتێ، هەرچەنـدە لای مـن زۆر جیاوازییـان لەگـەڵ یەکتـردا نییە. بەم شتانەدا بیـرم دەکەوێتـەوە، کـە مۆریی بەڕاستی مامۆستامە و خاڵـم نییـە.

دوانیوەڕۆیـەک، باسـی لەمپـەر و ناخۆشـییەکانی ئـەو قۆناغـەی تەمەنمـی بـۆ دەکـەم و لەوێـوە دێمـە سـەر باسـی ئـەو شـتانەی لێـم چـاوەڕێ دەکرێـن و ئەوانـەی خـۆم دەمـەوێ بەدەسـتییان بهێنم.

لێم دەپرسێت: میچ، تا ئێستا باسی دوو شتە دژبەیەکەکەم بۆ کردوویت؟

ــ دوو شتە دژ بەیەکەکە؟ نا!

ــ ژیان کۆمەڵێک بگرەوبەردەی زۆری تێدایە و لەیەک کاتدا بۆ پێشەوە و بۆ دواوە پاڵت دەنێ. تۆ دەتەوێ شتێک بکەی، ئەو ناچارت دەکات شتێکیتر بکەی، شتێک ئازارت دەدات کە خۆشت دەزانی شایانی ئەوە نییە بهێڵی ئازارت بدات، لەهەمانکاتدا گرنگیی بەهەندێ شتی گەورە نادەی، کە دەزانی دەبێ گرنگییان پێبدەی. ئەمانە شتە دژە بەیەکانن و زۆربەمان گیرۆدەیان بووین.

پێی دەڵێم: کەوابێ ژیان زۆرانبازییە.

بەپێکەنینەوە دەڵێت: «زۆرانبازی؟» ڕاستە، دەتوانی ئاواش وەسفی بکەی.

لێی دەپرسم: کەواتە کام لا دەیباتەوە؟

ــ کام لا دەیباتەوە؟!

پرسیارەکەم دووبارە دەکاتەوە و ئینجا بە ددانە خوراو و چاوە چرچەکانییەوە زەردەخەنەیەکم بۆ دەکات و دەڵێت: خۆشەویستی دەیباتەوە، میچ. خۆشەویستی هەمیشە دەیباتەوە.

# خوێندنەوەی ناوی ئامادەبووان

پاش چەند هەفتەیەک چووم بۆ لەندەن بۆ گواستنەوەی هەواڵەکانی پاڵەوانێتی (ویمبلدۆن)، کە یەکێکە لە پاڵەوانێتییە گەورەکانی تێنسی سەرزەوی و یەکێکیشە لەو ڕووداوە وەرزشییە کەمانەی کە تیایاندا ماندەران ناکەونە هاوار هاوار و لە گەراجی یاریگاکاندا کەس بە سەرخۆشی نابینیت. کەشوهەوای ئینگلتەرا گەرم و هەور بوو. بەیانیان هەڵدەستام و پیاسەیەکم بەشەقامەکانی دەوری یاریگاکاندا دەکرد. هەندێک هەرزەکارم دەبینی ڕیزیان دەبەست بۆ کڕینی ئەو بلیتانەی تا ئەو کاتە مابوون، هەندێک دەستگێڕیش شەربەتی فستیک بە کرێمیان دەفرۆشت. لەبەردەرگای یاریگا سەرەکییەکەشدا پیاوێک لەسەر مێزێکی گەورە ڕۆژنامە و گۆڤاری دانابوو. کابرا سەرمێزەکەی پڕکردبوو لەو ڕۆژنامە ڕەنگاوڕەنگە بەریتانیانەی کە زۆربەی لاپەڕەکانیان بەوێنەی ئافرەتی نیمچەڕووت، یان وێنەی خێزانی شاهانە، یان ئەستێرەی بەخت، یان هەواڵی وەرزشیی، یان یانسیب بلاودەکەنەوە و جاروباریش کەمێک هەواڵی گرنگی بەکورتی تێدەکەن. یەکێک لەو هەواڵە سەرەکییانەی ڕۆژنامەفرۆشەکان لەسەر تەختەڕەشێکی گەورە نووسیبوویان شتێکی لەمشێوەیە بوو: شازادە دایانا و چارلس نێوانیان تێکدەچێت.

خەڵک خێرا خێرا ڕۆژنامەکانیان هەڵدەگرت و ئەو هەواڵە کورتانەیان

دەخوێندەوە، کە زۆرجار هەر قسەلۆک بوون. منیش لەگەشتەکانی پێشوترمدا هەروامکردبوو، بەڵام ئەمجارەیان جیاوازبووم، هەرشتێکی بێبایەخم دەخوێندەوە، یان دەهاتە بەرچاو یەکسەر بیرم لە مۆریی دەکردەوە. بەردەوام وێنەکەیم دەهێنایە پێش چاوی خۆم: وێنەی پیاوێکی پیری نەخۆش لەماڵەکەی خۆیدا لەنزیک دارە گەڵاسوورەکە و لەناو ژوورەکان، وێنەی مۆریی ئەوکاتەی هەناسەکانی دەژمێرێت و لەململانێدایە لەگەڵ کات بەو هیوایەی ساتێک زیاتر لەگەڵ خۆشەویستەکانیدا بێت.

مۆریی لەوێ بەوشێوەیە دەژیا، منیش لێرەوە لەژیانی خۆمدا خەریکبووم کاتم بەهەندێک شتەوە بەسەردەبرد، کە لای خۆشم بێمانابوون، وەک ئەستێرەکانی سینەما، نمایشکارانی جلوبەرگ، کۆتا دەرکەوتنی (شازادە دیانا) یان (مادۆنا) یان (کوڕەکەی جۆن ئێف کەنەدی). ڕەنگە ئەمە بەلای زۆر کەسەوە سەیربێت، بەڵام بەڕاستی ئیرەییم بەو کاتە دەوڵەمەندەی مۆریی دەبرد هەرچەندە لەهەمانکاتدا زۆریش بەداخ بووم، کە دەمبینی تا دێت ئەو کاتە کەمتر و کەمتر دەبێتەوە. ئاخ! ئێمە بۆ ئەوەندە گرنگیی بەوشتانە دەدەین، کە نامێڵن کاتەکانمان وەک مۆریی بەسەربەرین؟

لە ئەمەریکاش باس باسی دادگاییکردنەکەی (ئۆ جەی سیمپسن) بوو. ئۆ جەی تاوانبار کرابوو بە کوشتنی ژنەکەی و هاوڕێیەکی ژنەکەی. ژمارەیەکی زۆر خەڵک لەپشووی نانی نیوەڕۆدا چەند کاتییان هەبووایە سەیری دادگاییەکەیان دەکرد و ئەوەی تریشیان تۆمار دەکرد بۆ ئەوەی شەو سەیری بکەن. زۆریەی خەڵکەکە نە (ئۆ جەی سیمپسن)یان دەناسی، نە هیچ کەسێکی تریش، کە بشێت لەتاوانەکەدا دەستی هەبووبێت، کەچی خەو و خۆراکیان ببوو بە تەماشاکردنی ئەو دادگاییکردنە و چەندین ڕۆژ و هەفتەی ژیانی

خۆیان تەرخانکردبوو بۆ کارەساتی ناو ژیانی کەسانیتر.

شتێکم بیرکەوتەوە، کە مۆریی لەسەردانەکەمدا بۆ لای پێیگوتبووم: ئەو کولتوورەی هەمانە و لەسەری گەورەبوویین وا لەخەڵک نەکات لەبەرامبەر خۆیاندا هەستی باش و دروستکەریان هەبێ. بۆیە دەبێ ئەوەندە بەهێز بی، کە ئەگەر کلتوورەکەت بەکەڵکت نەهات قبوڵت نەبێ.

بەڕاستی مۆریی لەکاتێکی زۆر پێش نەخۆشیەکەشییەوە، کولتوورێکی تازەی بۆ خۆی دروستکردبوو. ئەو گروپانەی بۆ گفتوگۆ دروستی دەکردن، پیاسەکانی لەگەڵ هاوڕێ و دۆستەکانی، سەماکردنەکانی لە هۆڵی کەنیسەی هارڤارد سکوێیەر، هەموو نمونە بەڵگەی دروستبوونی ئەو کولتوورە تازەیەی مۆریی بوون.

مۆریی دەستیکرد بە کارکردن لەپرۆژەیەکی نوێدا و ناوی نا (لانەی سەوز). لەو پرۆژەیەدا خەڵکانی دەستکورت بەخۆڕایی چارەسەریی دەروونییان بۆ دەکرا. مۆریی بەردەوام کتێبی تازەشی دەخوێندەوە بۆ وانەگوتنەوەکانی، سەردانی هاوڕێ و خوێندکارەکانی خۆی دەکرد، پەیوەندی بە خوێندکارە کۆنەکانییەوە دەکردەوە و نامەی بۆ ئەو هاوڕێیانەشی دەنارد، کە لەدوور دەژیان. زیاتر کاتی بە خواردن و چوونە ناو سروشتەوە بەسەردەبرد و ئامادەنەبوو هیچ لە کاتی خۆی لەبەردەمی تەلەفیزیۆندا بەسەربەرێت. خۆی خەریک کردبوو بەچەندین چالاکی مرۆڤانەی جوانەوە وەک، گفتوگۆکردن، پەیوەندی بەستن و تێکەڵاوبوون، خۆشەویستی گۆڕینەوە و چەندین شتیتر. ژیانی وەک قاپێک شۆربای پڕی لێهاتبوو، کە خەریکبوو لێی دەڕژا.

منیش لەولاوە کولتووری خۆمم دروستکردبوو: کولتووری کارکردن، کارکردن و تەواو. چوار بۆ پێنج کاری ڕاگەیاندم لە ئینگلتەرا هەبوو،

وەک بەرد هەڵماقۆم پێدەکردن. ڕۆژانە هەشت سەعاتم لەبەردەمی کۆمپیوتەرەکەمدا بەسەردەبرد و ئەو هەواڵانەی دەستم کەوتبوون دەمگەیاندنەوە ئەمەریکا. جارجاریش بەرنامەی تەلەفیزیۆنیم ئامادە دەکرد و لەگەڵ هاوکارەکانمدا بەبەشەکانی (لەندەن)دا دەگەڕاین. هەموو بەیانییەک یان دوانیوەڕۆیەکیش دەبوو پەیوەندی بکەم بەبەرنامە ڕادیۆییەکانەوە و قسەیان بۆ بکەم. کردنی ئەم هەموو نیشە لەیەککاتدا بەلامەوە ئاسایی بوو، چونکە من چەندین ساڵ بوو کارکردنم کردبووە هاودەمی هەمیشەییم و هەموو شتێکی ترم بۆ خستبووە لاوە.

لە وێمبڵدۆن هەر لەو ژوورە بچووکەدا نانم دەخوارد، کە کارم تێدادەکرد، بەڵام گوێم نەدەدایە. لەیەکێک لە ڕۆژە پڕشێتیەکانی پاڵەوانێتیەکەدا، ژمارەیەکی زۆر ڕۆژنامەنووس دوای یاریزانی بەناوبانگی ئەمەریکی (ئەندریا ئەگاسی) و (بروک شیڵدز)ی خۆشەویستی کەوتن بۆ ئەوەی هەواڵێکیان لێیانەوە دەست بکەوێت. لەملاشەوە وێنەگرێکی بەریتانی بەخۆی کامێرا گەورەکەی ملییەوە خۆی پێدا کێشام و هەر داوای لێبووردنیشی نەکرد. لەوکاتەدا بیری شتێکیترم کەوتەوە کە مۆریی پێیگوتبووم: کەسانێکی زۆر ژیانێکی بێمانا دەژین. بەردەوام وەک خەواڵوو وان، تەنانەت ئەوکاتەش کە پێیانوایە خەریکی کارێکی گرنگن هەر خەواڵوون. هۆکاریش ئەوەیە کە بەدوای شتە هەڵەکاندا ڕادەکەن. لەڕاستیدا مرۆڤ بەوە دەتوانێ مانا بۆ ژیانی بگەڕێنێتەوە، کە ژیانی تەرخانبکات بۆ خۆشویستنی کەسانیتر، بۆ دەوروبەرو کۆمەڵگاکەی، بۆ هێنانە کایەی شتێک، کە مانا و ئامانج بەژیانی ببەخشێ.

دەمزانی مۆریی ڕاست دەکات، بەڵام هێزی ئەوەم نەبوو کارێک بکەم ئەو قسە ڕاستانەی مۆریی لەبیرکردنەوە و هەڵسوکەوتمدا

ڕەنگبدەنــەوە.

لەکۆتایی پاڵەوانێتیەکەدا و دوای خواردنــەوەی ســەدان کــوپ قــاوە بەدیار ئامادەکردنی هەواڵەکانییــەوە، کۆمپیوتەرەکەمم داخســت و ژوورە بچووکەکەمــم پاککــردەوە. دواتــر گەڕامــەوە بــۆ شــوقەکەم بــۆ ئــەوەی شتەکانم کۆبکەمــەوە و خــۆم ئامادەبکــەم بــۆ گەڕانــەوە. درەنــگ بــوو. بەخشــی زۆربــەی کەناڵــە تەلەفیزیۆنــەکان تــەواو ببــوو.

دواجــار بەفرۆکــە گەڕامــەوە بــۆ دیترۆیــت. دوانیوەڕۆیەکــی درەنــگ گەیشــتم. خــۆم کــرد بەماڵدا و یەکســەر چــووم خەوتم. بەســەر هەواڵێکی ســەیردا خەبــەرم بــووەوە: کارمەندانــی ئــەو ڕۆژنامەیــەی کارم تێدادەکرد مانیــان گرتبــوو، دەزگاکــەش داخرابــوو، لەبــەردەم دەرگای دەرەوەشــیدا چەنــد مانگرتوویــەک خڕبببوونــەوە و هەندێکیتریــش بەدرێژایــی شــەقامەکە بەبــێ وەســتان هوتافیــان دەکێشــا. بەهــۆی ئــەوەی منیــش کارمەنــدی ئــەوێ بــووم، بــەو ڕووداوانــە منیــش بــۆ یەکەمجــار لــە ژیانمــدا کارێکم لەدەســتدا. داهاتــم کەمــی کــرد و کەوتمــە ململانێــوە لەگــەڵ خــاوەن کارەکەمــدا. ڕێکخەرانــی مانگرتنەکــە تەلەفۆنیــان بــۆ کــردم بــۆ ماڵــەوە و ئاگاداریــان کردمــەوە، کــە ئەگــەر بەڕێوەبەرانــی ڕۆژنامەکــە، کــە زۆریەیان هاوڕێــم بــوون، پەیوەندییــان کــرد و داوایــان لێکــردم پشــتگیرییان بکــەم، پێویســتە ڕازی نەبــم و تەلەفۆنەکەیــان بەســەردا دابخەمــەوە.

لەســەر تەلەفۆنەکــە ڕێکخــەری ســەرەکی مانگرتنەکــە وەک ســەربازی ڕیــزی پێشــەوەی جەنــگ هــاواری دەکــرد: تــا بردنــەوە دەجەنگیــن، تــا بردنــەوە.

هەســتم بەســەرلێشــێوان و بێتاقەتــی دەکــرد. هەرچەنــدە مووچــەی ڕادیــۆ و تەلەفیزیۆنــم بــاش بــوو، بــەڵام زیاتــر گرنگیــم بــە کارکــردن لەڕۆژنامەکــەدا دەدا و کارەکــە بەتەواوەتــی ببــووە ژیانــم. کاتێــک بەیانیان لەڕۆژنامەکــەدا ئــەو هەواڵانــەم دەبینــی کەخــۆم ئامــادەم کردبــوون،

هەستمدەکرد لانیکەم بەشێوەیەک لە شێوەکان هێشتا زیندووم.

هەموو ئەو شتانەم لەدەستدا. مانگرتنەکە درێژەی کێشا، ڕۆژێک، دووان، سێیان، تەنانەت دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆوە تاچەند مانگێک بەردەوام دەبێت. ڕیتمی ژیانم تێکچوو. شەوانە زۆر ڕووداوی گرنگی وەرزشیم دەبینی، کە ئەگەر ئەو مانگرتنە نەبوونایە لەجیاتی ئەوەی لەماڵەوە دانیشم و لەسەر تەلەفیزیۆن سەیریان کەم دەچووم لەوێوە خۆم هەواڵەکانیانم دەگواستەوە. لەماوەی کارکردنەکەمدا گەیشتبوومە ئەو بڕوایەی ئەو ستوونەی من نەمێنێت خوێنەران زۆریان پێناخۆش دەبێت، بەڵام دوای ئەو ڕووداوانە سەرم سوڕما لەوەی کە شتەکان بەبێ منیش چەند بە ئاسانی دەڕۆیشتن.

دوای هەفتەیەک لەم دۆخە، تەلەفۆنەکەمم هەڵگرت و تەلەفۆنێکم بۆ مۆریی کرد. کۆنیی، مۆریی هێنای بۆ لای تەلەفۆنەکە و یەکسەر مۆریی گوتی: دێیت بۆ لام؟

قسەکەی زیاتر لە ڕستەیەکی هەواڵیی دەچوو، نەک پرسیاریی.

– کەی بۆ ئێوە باشە بێم؟

– سێشەممە چۆنە؟

– زۆرباشە، سێشەممە گونجاوە.

***

لەقۆناغی دووی زانکۆ دوو کۆرسیتری مۆریی وەردەگرم. پەیوەندییەکانی من و مۆریی تەنها لەو یەکتربینینانەدا نامێننەوە، کە لەهۆڵی وانە خوێندندا ڕوودەدەن، بەڵکو لەوەودوا زوو زوو یەکتر دەبینین و گفتوگۆ لەسەر بابەتی جیاواز دەکەین. هەرچەندە جگە لەخزم و کەسە نزیکەکانم، پێشتر ئەم جۆرە یەکتربینین و گفتوگۆیانەم لەگەڵ کەسێکی لەو تەمەنەدا نەبووە، لەگەڵ مۆریی زۆر هەست بەئاسوودەیی دەکەم. وا هەستدەکەم ئەویش پێیخۆشە، کە کات دەدۆزێتەوە بۆ ئەم گفتوگۆیانە.

خۆم دەکەم بەژوورەکەیدا و بەخۆشییەوە لێم دەپرسێت: ئەمڕۆ بچین بۆ کوێ؟

بەهاران، لەژێر دارێکی باخچەی بەشی کۆمەڵناسی دادەنیشین، زستانانیش لەژوورەکەی خۆی، من بە بلوزە ڕەساسی و کالە ئەدیداسەکانمەوە ئەویش بە جوتێک پێلاوی قەیتاندارو پانتۆڵە قەیفەکەیەوە. هەموو جارێک، کە پێکەوە دەچین بۆ پیاسە سەرەتا گوێم لێدەگرێت تا من قسەی خۆم دەکەم ئینجا ئەو دەکەوێتە قسە و هەوڵدەدات وانەی نوێم لەسەر ژیان فێربکات. ئاگادارم دەکاتەوە لەوەی کە پارە گرنگترین شت نییە، وەک ئەوەی زۆر خەڵک تێیگەیشتوون. ئامۆژگارییم دەکات، کە «بەتەواوی مرۆڤ» بم. باسی ئەو نامۆبوونەم بۆ دەکات،

کە لە گەنجیدا تووشی مرۆڤ دەبێت و دواتر لەو بابەتەوە دێتەسەر ئەوەی کە ئێمە چەندە پێویستمان بەوەیە لە کۆمەڵگا و دەوروبەرەکەمان نزیک ببینەوە. لە هەندێک لە قسەکانی دەگەم و سەر لەهەندێکیان دەرناکەم، بەڵام ئەوە لای من گرنگ نییە. گرنگ ئەوەیە مۆریی دەرفەتی ئەوەم دەداتێ هەندێک گفتوگۆی کوڕوباوکانەی لەگەڵدا بکەم، کە ناتوانم لەگەڵ باوکی خۆمدا بیانکەم.

باوکم حەزدەکات ببم بە پارێزەر. مۆرییش ڕقی لەپارێزەرەکانە.

مۆریی لێم دەپرسێت: دەتەوێ دوای دەرچوونت ببی بە چی؟

وەڵام دەدەمەوە: دەمەوێ ببم بە ژەنیار، ژەنیاری پیانۆ.

ــ جوانە! جوانە! بەڵام بزانە ژەنیار ژیانیان ئاسان نییە!

ــ ڕاستە

ــ ڕکابەریی زۆری تێدایە.

ــ وایە، بیستوومە.

ــ بەڵام ئەگەر بەڕاستی بتەوێ ببی بەژەنیار، خەونەکەت دێتەدی.

دەمەوێ باوەشی پێدابکەم و لەناخی دڵمەوە سوپاسی بکەم بۆ ئەو هاندانەی، بەڵام من کەسێکی زۆر کراوە نیم، بۆیە تەنیا سەرێکی بۆ دەلەقێنم.

پێم دەڵێت: دڵنیام دەبی بە پیانۆژەنێکی بەجۆشوخرۆش و لێهاتوو.

پێدەکەنم و دەڵێم: بەجۆشوخرۆش؟!

بەدوای مندا پێدەکەنێ: بۆ پێدەکەنی؟ وشەکەت پێ سەیرە؟ باوی نەماوە؟

## سێشەممەی یەکەم
## باسی دونیا دەکەین

کۆنیی دەرگاکەی لێکردمەوە و چوومە ژوورەوە. مۆریی لەتەنیشت مێزی نانخواردنەکەوە لەسەر عەرەبانەکەی دانیشتبوو. کراسێکی لۆکەی فش و پانتۆڵێکی ڕەشی فشتر لەکراسەکەی لەبەردابوو. مۆریی بۆیە جلەکانی فش ببوون بەبەری لەبەرئەوەی قاچەکانی بەشێوەیەکی سەیر باریک ببوون، ئەگەر ڕانیت بەهەردوودەست بگرتایە پەنجەکانت لەیەکیان دەدایەوە. ئەگەر بیتوانیایە بەپێوەش بوەستێت، درێژییەکەی لە پێنج پێ زیاتر نەدەبوو، بەدووری نازانم کاوبۆی خوێندکاری پۆلی شەشی بنەڕەتی بۆ ببووایە.

لەدوورەوە عەلاگە قاوەییەکەی دەستمم بەرزکردەوە و هاوارم لێکرد: شتم بۆ هێناوی، شت!

کاتێک فرۆکەخانەم بەجێهێشت و بەرێ کەوتم بۆ ماڵی مۆریی، لە ڕێگادا لامدایە سوپەرمارکێتێک و هەندێ گۆشتی قەل و زەلاتەیەکی پەتاتە و زەلاتەیەکی مەعکەرۆنی و چۆرەکم کڕی. دڵنیابووم خۆیان خواردن و چێشتێکی زۆریان هەیە، بەلام پێمخۆشبوو شتێکم هەر پێبێت. هەر ئەوەم پێدەکرا. دەشمزانی مۆریی حەزی لەخواردنە.

مۆریی بەگۆرانی گوتنەوە وەلامی دامەوە: ئەو هەموو خواردنا!!!. دەبێ خۆشت لەگەڵم بخۆۆۆی.

لـە مەتبەخەکـە بـەدەوری مێـزی نانخواردنەکـەدا دانیشـتین، کـە هەرچوار لای ئـەو کورسـییانە بـوون، کـە بەشـووڵ چنـراون. ئەمجارەیان بەبـێ ئـەوەی پێویسـت بـەوە بـکات قەرەبووی شـانزە سـاڵ زانیاریـی نەگۆڕینـەوە بکەینـەوە، خۆمـان هەڵدایـەوە نـاو هەمـان گفتوگۆکانـی سـەردەمی زانکـۆ، هـەروەک ئەوکاتـەی مۆریـی پرسـیاری لێدەکـردم و چاوەڕێـی وەڵامـی منـی دەکـرد، منیـش، کـە وەڵامـم دەدایـەوە، وەک چێشـلێنەرێکی کارامـە قسـەیەکی دەکـردە نـاو قسـەکانمەوە، کـە خـۆم نەمگوتبـوو.

پرسـیاری لێکـردم دەربـارەی مانگرتنـی کارمەندانـی دەزگاکـە. کـە وەڵامـم دایـەوە بەڕاسـتی سـەری سـوڕما و بەدڵپاکییەوە لێی پرسـیم، کە بۆچـی هـەردوولا نەیانتوانیـوە لەیەکتـری تێبگـەن و کێشـەکە چارەسـەر بکـەن. منیـش پێمگـوت، کـە هەمـوو کەسـێک وەک ئـەو زیـرەک نییـە.

ناوبەنـاو، مۆریـی دەبوایـە دەسـت لەخـواردن هەڵگرێـت و بچێـت بـۆ سـەرئاو، ئـەوەش کاتێکـی زۆری دەویسـت. کۆنیـی هەربەسـەر عەرەبانەکـەوە دەیبـرد بـۆ تەوالێتەکـە، پاشـان دایدەگـرت و دەسـتی دەگـرت تـا میزەکـەی دەکـرد. دوای هەمـوو هاتنەوەیـەک مۆریـی تـەواو هیـلاک دەبـوو.

پێـی گوتـم: بیرتـە کـە بـە (تێـد کۆپێـڵ)م گـوت بـەو زووانـە پێویسـتیم بـەوە دەبـێ یەکێـک قنـم بـۆ پاکبکاتـەوە؟

بەپێکەنینەوە گوتم: کەس هەیە ئەو قسەیەی بیرچێتەوە.

- دە زۆر بەداخەوە وابزانم ئەو ڕۆژە زۆری نەماوە.

- بۆچی پێت ناخۆشە؟

- لەبەرئـەوەی ئـەوە دوا پلـەی پشتبەسـتنە بەکەسـانیتر، بـەڵام ئـەوەش ئاسـایی وەردەگـرم. تەنانەت هەوڵدەدەم خۆشـییش لەپرۆسـەکە وەربگـرم.

- خۆشیی لێوەرگری؟!
- بەڵێ! دواجار چانسی ئەوەم هەیە جارێکیتر منداڵ ببمەوە.
- بەڕاستی ئەوە لێکدانەوە و قبوڵکردنێکی نایابە مۆریی.
- میچ گیان، ئێستا ئیتر دەبێ وەک شتێکی نایاب لەژیان بروانم. ڕاستە ناتوانم بچم بۆ بازاڕ، ناتوانم ئاگام لە حسابە بانکییەکانم بێ، ناتوانم خۆڵ و پیسی ناوماڵەکەشم بەرمە دەرەوە، بەڵام خۆ دەتوانم لێرە دانیشم و لەگەڵ کەمبوونەوەی ڕۆژەکانی ژیانمدا بیر لەو شتانە بکەمەوە، کە بەگرنگیان دەزانم. هەم کاتم هەیە و هەم هۆکاریشم هەیە بۆ کردنی ئەم کارە.

منیش بەشێوەیەک کە وادەردەکەوت تانە لەقسەکانی بدەم گوتم: کەواتە نهێنی تێگەیشتن لە ژیان ئەوەیە چیتر خۆڵ نەبەینە دەرەوە؟

وامگوت و مۆریی پێکەنی. ئەوەم زۆر پێخۆش بوو.

***

لەکاتێکدا کۆنیی خەریکی کۆکردنەوەی قاپەکان بوو، سەفتەیەک ڕۆژنامەم بینی کەدیاربوو پێش ئەوەی بگەمە ئەوێ کەسێک خوێندبوونیەوە.

لەمۆرییم پرسی: ئێستاش هەر بەدوای هەواڵەکاندا دەڕۆی؟

وەڵامی دایەوە: بەڵێ، بۆ پێت سەیرە؟ پێتوایە لەبەرئەوەی دەمرم ئیتر دەبێ بەلامەوە گرنگ نەبێ چی لەم دونیایەدا دەگوزەرێ؟

- دەڵێم ڕەنگە وابێ.

ئاهێکی هەڵکێشا: ڕەنگە تۆ ڕاست بکەی و پێویست نەکات من چیتر گرنگیی بەوشتانە بدەم. دواجار من لێرە نامێنم تا بزانم شتەکان بەچی دەگەن. بەڵام میچ! شتێک هەیە نازانم چۆن

بۆت ڕوونبکەمەوە. ئێستا کە من لەم ئازارەدام لەجاران زیاتر هەست بەنزیکیی دەکەم لەو کەسانەوە، کەئازار دەچێژن. ئەو شەوە لەیەکێک لە کەناڵەکانەوە خەڵکی (بۆسنە)م بینی چۆن تەقەیان لێدەکرا و ئەوانیش بەسەر ئەو شەقامانەدا ڕایاندەکرد، دەکوژران و دەبوونە قوربانیی بێتاوان. بەو دیمەنانە گریام. هەستم بە ئازارەکانیان دەکرد وەک ئەوەی هی خۆم بن. من هیچکام لەو کەسانە ناناسم بەڵام نازانم چۆن بڵێم، هەست دەکەم زۆر لێمەوە نزیکن. هەستدەکەم بەشێکن لە من.

چاوەکانی مۆریی تەڕبوون. هەوڵمدا بابەتەکە بگۆڕم، بەڵام چاوی سڕی و بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت دەستێکی بۆ بەرزکردمەوە وەک ئەوەی داوام لێبکات بابەتەکە نەگۆڕم. دەستی بەقسە کردەوە و گوتی: ئێستا زوو زوو دەگریم، ئەوەش شتێکی زۆر ئاساییە.

بەڕاستی سەرم لەو هەڵوێستەی مۆریی سوڕمابوو. من چەند ساڵێک پەیامنێریم کردبوو، هەواڵی مردنی چەندین کەسم گواستبۆوە، چاوپێکەوتنم لەگەڵ زۆر خێزانی کۆستکەوتوو کردبوو، تەنانەت بەشداریی زۆر مەراسیمی بەخاک سپاردنیشم کردبوو، بەڵام لەهیچکام لەو ڕووداوانەدا نەگریابووم. مۆریی لێرەوە بۆ ئازاری خەڵکی ئەوسەری دونیا دەگریا! لەدڵی خۆمدا لەخۆمم پرسی: بڵێی لەکۆتاییدا ئێمەش وامان لێبێ؟

ڕەنگە مردن تاکە شت بێت، کە خەڵک هەموو تێیدا یەکسانن، یان تاکە شتی گەورە بێت، کە دواجار وا لە نەناسیاوەکانیش دەکات فرمێسک بۆیەکتر بڕێژن.

مۆریی دەستەسڕەکەی خستەسەر دەم و لوتی و فنێکی توندی کرد، ئینجا لێی پرسیم: تۆ بەلاتەوە ئاساییە پیاو بگری؟

زۆر بەخێرایی گوتم: بەڵێ، بەڵێ، بەدڵنیاییەوە.

پێکەنینێک کەوتە سەر دەموچاوی: میچ! من دەبێ تۆ نەرم بکەم! دەبێ ڕۆژێک نیشانت بدەم، کە گریان زۆر ئاساییە.

وەلامم دایەوە: بێگومان، بێگومان ئاساییە.

ئەویش گوتی: وایە وایە ڕاست ئەکەی.

هەردووکمان کەوتینە پێکەنین. بیست ساڵ لەوەوبەریش لەکۆتایی گفتوگۆکاندا هەر ئەو قسەیەی دەکرد، بەزۆریی لەسێشەمماندا.

لەڕاستیدا، سێشەممە هەمیشە ڕۆژی من و مۆریی بووە پێکەوە: زۆربەی وانەکانم لەگەڵ مۆریی لە سێشەمماندا بوون، هەر لەسێشەمماندا دەڕۆیشتین بۆلای بۆ ژوورەکەی خۆی بۆ وانەخوێندن، بیرمە لەماوەی نووسینی توێژینەوەکەشمدا هەر بە سێشەممان دەچووم بۆ لای و پێکەوە لەژوورەکەی خۆی یان لەکافتریا، یان لەسەر قادرمەکانی هۆڵەکە دادەنیشتین و بە ئیشەکەمدا دەچووینەوە. لەبەرئەوە شتێکی زۆر تایبەت و خۆش بوو، کە دوای ئەو هەموو ساڵە لەماڵی خۆیدا و لای ئەو دارە گەڵاسوورەوە دیسان لەسێشەممەیەکدا یەکترمان بینییەوە. لەگەڵ خۆئامادەکرنمدا بۆ ڕۆیشتن، هەموو ئەمانەم بەبیری مۆریی هێنایەوە.

مۆریی گوتی: میچ، ئێمە خەڵکانی سێشەممەین!

قسەکەیم دووبارە کردەوە: خەڵکانی سێشەممەین!

- میچ، تۆ ئەوەت بەلاوە سەیربوو، کە من چۆن خەفەت بۆ ئەو کەسانە دەخۆم، کە هەر ناشیانناسم، بەس ئێستا با پێت بڵێم گرنگترین شت چییە، کە ئەم نەخۆشییە فێرمدەکات؟

- چییە؟

- گرنگترین شت لەژیاندا ئەوەیە مرۆڤ فێرببێ چۆن خۆشەویستی بداتەوە و چۆنیش ڕێگە بۆ خۆشەویستی بکاتەوە بێتەناوی.

بەچرپە ئەمەی بۆ قسەکانی زیادکرد: میچ، ڕێگەی بۆ بکەرەوە

بـێ. ئێمـه پێمانوایـه شـایانی خۆشەویسـتی نیـن، وادەزانیـن ئەگـەر ڕێگـه بدەیـن خۆشەویسـتی بمانگاتـێ کەسـێکی زۆر نـەرم و لاوازمـان لێدەردەچـێ، بـەڵام پیاوێکـی ژیـر هەیـه نـاوی (لێڤیـن)ە، زۆر جـوان ئـەم بابەتـەی ڕوونکردۆتـەوە. لێڤیـن دەڵـێ: خۆشەویسـتی تاکـه کاری عاقڵانـەی مرۆڤـه.

مۆریـی زۆر بەوریاییـەوە قسـەکەی دووبـارە کـردەوە و لەسـەر یەکـە یەکەی وشـەکان وەسـتا: خۆشەویسـتی... تاکـه... کاری... عاقڵانەی... مرۆڤە.

وەک خوێندکارێکـی گوێڕایـەڵ سـەرم بـۆ لەقانـد و هەناسـەیەکم هەڵمـژی، ئینجـا خـۆم بەسـەریدا نووشـتاندەوە و باوەشـم پێداکـرد. دواتـر، هەرچەنـدە خـووی منیـش نەبـوو، دەمـم بـرد و ماچێکـی ڕوومەتییـم کـرد. لەسـەر قۆڵەکانـم هەسـتم بـه دەسـته لاوازەکانـی و لەسـەر دەموچاویشـم هەسـتم بـه مووەکانـی ڕیشـی کـرد.

بەچرپە لێی پرسیم: کەواتە سێشەممەی ئاینده دێیتەوە؟



خۆیدەکات بە پۆلدا، دادەنیشێت و هیچ ناڵێت. بۆ ماوەیەک سەیرمان دەکات و ئێمەش سەیری دەکەین. سەرەتا یەک دوو کەس پێکەنینیکیان لێوەدێت بەڵام مۆریی تەنها شانێک هەڵدەتەکێنێت و هیچیتر. دوای چەند ساتێک بێدەنگییەکی تەواو باڵ بەسەر تەواوی پۆلەکەدا دەکێشێت، بەشێوەک گوێمان لە زەیتییەکەیە، کە لەسوچێکی ژوورەکەدا زەیتەکەی ناوی قوڵپ دەدا، گوێمان لەهەناسە بەهێزەکانی یەکێک لە خوێندکارە قەڵەوەکانە.

هەندێکمان بێزار دەبین و لەدڵی خۆماندا دەڵێین: ئەرێ ئەمە کەی شتێک دەڵێ؟

هەندێکمان لەشەرمان دەکەوینە جووڵە جووڵ و خۆسەرقاڵکردن، سەیری سەعاتەکانمان دەکەین. هەندێک لەپەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکەن و دەیانەوێت خۆیان لەبێدەنگییەکە بدزنەوە. وانەکە بۆماوەی پانزە دەقیقە بەمشێوەیە دەڕوات. دواجار مۆریی بەچرپەک بێدەنگییەکە دەشکێنێت و دەڵێت: چییە؟ چیتانە؟

لەوێوە ئەو گفتوگۆیە دروست دەبێت، کە مۆریی هەر لەسەرەتاوە مەبەستیی بووە دروست ببێت. گفتوگۆ لەسەر کاریگەریی بێدەنگیی دەکەین لەسەر پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان. باشە ئێمە بۆ ئەوەندە شەرم لە بێدەنگیی دەکەین؟ چ خۆشیی و ئاسوودەییەکمان لەو

هەموو ژاوەژاوەی دونیا دەستکەوتووە؟

من بە بێدەنگییەکە بێزارم نابم. هەرچەندە لەگەڵ هاوڕێکانمدا زۆر قسە دەکەم و بەدەنگەدەنگم. بەڵام هێشتا ئامادە نیم لەبەردەمی کەسێکدا، بەتایبەت هاوپۆلەکانم. قسە بکەم و هەستەکانی خۆم بەتەواوەتی دەرببڕم. ئەو ڕۆژە ئەگەر پێویستبووایە دەمتوانی چەند سەعاتێک بەوشێوەیە بەبێدەنگی دابنیشم.

کاتێک وانەکە تەواو دەبێت، هەڵدەستم بڕۆمە دەرەوە. پێش ئەوەی بگەمە دەرگاکە مۆریی دەموەستێنێ: تۆ ئەمڕۆ هیچی وات نەگوت.

ـ نازانم! ڕاستییەکەی هیچی وام نەبوو بیڵێم.

ـ نا، میچ، وامەڵێ! زۆرت پێیە بیڵێی. ڕاستییەکەی تۆ کەسێکم بیردەخەیتەوە، کە ئەویش وەک تۆ لەگەنجیدا حەزیدەکرد شتەکان لەناو خۆیدا بهێڵێتەوە.

ـ کێ؟

ـ خۆم.

## سێشەممەی دووەم
## باسی بەزەیی بەخۆداهاتنەوە دەکەین

سێشەممەی دواتر و چەندین سێشەممەی تریش چوومەوە بۆ لای مۆریی. ڕەنگە بەلای زۆر کەسەوە سەیربێت ئەگەر بڵێم، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەبوو حەوت سەد میل بە فڕۆکە بڕۆم بۆئەوەی بگەمەوە تەنیشت پیاوێک، کە لەسەرەمەرگدا بوو، بەڵام هێشتا دوای هەموو سەردانێک بەوپەڕی تامەزرۆییەوە چاوەڕێمدەکرد سێشەممە بێتەوە.

لەسەردانەکانمدا بۆلای مۆریی واهەستمدەکرد کات زۆر خێرا دەڕوات، کە دەشچوومە بۆلای زیاتر دڵم بەخۆم خۆشدەبوو. لەڕێگای نێوان فڕۆکەخانە و ماڵی (مۆریی)دا زۆرجار لەهاوکارەکانمەوە تەلەفۆنم بۆ دەهات، بەڵام هەڵمنەدەگرتن. لەدڵی خۆمدا لاسایی مۆرییم دەکردەوە و دەمگوت: هەرکەسێکە با جارێ چاوەڕێ بێ.

لە دیترۆیت کێشەی ڕۆژنامەکە و کارمەندە مانگرتووەکان چارەسەر نەکرابوون. لەڕاستیدا، شتەکە زۆر بێمانا ببوو. چەندینجار پێکدادان لەنێوان مانگرتووەکان و ئەو کرێکارانەدا ڕوویدابوو، کە بۆ شوێنگرتنەوەی مانگرتووان خرابوونە سەرکار. چەندین کەس لێیاندرا و دەستگیرکران، چەندینیتر لەناوەڕاستی شەقامەکاندا لەبەردەمی ئەو سەیارانەدا پاڵدەکەوتن، کە ڕۆژنامەکانیان دەگواستەوە. کاتێک لەناو

ئەم ڕووداوانەوە دەڕۆیشتم بۆ لای مۆریی، بەزەیی و هەستی مرۆڤانە لەناومدا زیندوو دەبوونەوە.

ئەو سێشەممەیە باسی ژیان و خۆشەویستییمان کرد، باسی شتێکمانکرد، کە بەلای مۆرییەوە خۆشترین بابەت بوو: بەزەیی و هۆکارەکانی نەبوونی لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا.

لەسێیەم سەردانمدا پێش ئەوەی بگەمە نزیک ماڵیان، لە دوکانێک لامدا کەناوی (برێد ئاند سێرکس) بوو، عەلاگەکانی ئەو دوکانەم لەماڵی مۆریی بینیبوو بۆیە گوتم ڕەنگە حەزی لەخواردنی ئەوێ بێت. سەبەتەیەکم پڕکرد لەو خواردنە تازانەی دایان نابوون: بریانی و زەڵاتەی گێزەر و پاقلاوە.

خۆمکرد بەژوورەکەی (مۆریی)دا و عەلاگەکانم بەرزکردەوە وەک ئەوەی بانکم بۆ بریبێت.

هاوارمکرد: کابرای خواردن هاتەوە!

مۆریی سەیرێکی کردم و زەردەخەنەیەکی کرد.

لێی وردبوومەوە بۆئەوەی بزانم نەخۆشییەکە تاکوێ لەگەڵی ڕۆیشتووە: تا ئەو کاتەش پەنجەکانی بەباشی ئیشیان دەکرد، دەیتوانی بنووسێت و پەرداخ بگرێت، بەڵام نەیدەتوانی تا ئاستی سنگی زیاتر قۆڵەکانی بەرز بکاتەوە. تادەهات کاتێکی کەمتریشی لەمەتبەخەکە و ژووی میوانەکەدا بەسەردەبرد و زۆربەی کات لەژوورەکەی خۆیدا دەمایەوە. لەوێ لەسەر کورسییەک، کە هەمووی سەرین و بەتانی بوو پاڵی دەدایەوە. کورسییەکەی لەبەشی خوارەوەی پارچەیەک ئیسفنجی پێوەبوو، کە یارمەتی دەدا قاچەکانی ئاسانتر ڕابگرێت. زەنگێکیشی لەتەنیش خۆیەوە دانابوو، ئەگەر بیویستایە سەری بجولێنێت یان وەک خۆی دەیگوت «بچێتە سەر قەعدەکەی،» زەنگەکەی لێدەدا و کۆنیی، تۆنی، بێرسا، یان

ئامی دەهاتن بەلایەوە. هەڵگرتنی زەنگەکە هەموو جارێ ئاساز نەبوو، هەندێکجار نەیدەتوانی لێبیدات و زۆر پەست دەبوو.

لێمپرسی کە بەزەیی بەخۆیدا نایاتەوە.

وەڵامی دامەوە: هەنێکجار لەبەیانیاندا بەڵێ. کەمێک بۆخۆم بێتاقەت دەبم، سەیری جەستەم دەکەم و دەست و پەنجەکانم دەجوڵێنم، ڕاستییەکەی هەر ئەندامێکم، کە تائێستا بتوانم بیجوڵێنم دەیجوڵێنم، ئینجا نیگەران دەبم بۆ ئەوەی لەدەستم چووە، هەروەها بۆ ئەو مردنە هێواشەی بەرەوڕووی دەڕۆم، بەڵام هەر زوو کۆتایی پێدەهێنم و ناهێڵم زۆر بخایەنێ.

- هەر ئاوا بەسادەیی؟

- ئەگەر پێویست بکات گریانێکی باشیش دەگریم، بەڵام دوای ئەوە دەستدەکەم بەبیرکردنەوە لەو هەموو شتە باشەی کە هێشتا لەژیانمدا ماون. بیر لەوکەسانە دەکەمەوە، کە دێن و سەردانمدەکەن، ئەو چیرۆکانەی بۆم دەگێڕنەوە، ئەگەر سێشەممەش بێ بیر لە تۆ دەکەمەوە... لەبەر ئەوەی من و تۆ خەڵکانی سێشەممەین.

زەردەخەنەیەکم کرد: خەڵکانی سێشەممە!

- میچ، لەوە بترازێ ڕێگە نادەم زیاتر بەزەییم بەخۆمدا بێتەوە. هەموو بەیانییەک تۆزێک بەزەیی، چەند فرمێسکێک و تەواو.

بیرم لە هەموو ئەو کەسانە کردەوە، کە دەمناسین و چەندین کاتژمێر لەکاتی ڕۆژانەیان بە بەزەییهاتنەوە بەخۆیاندا بەسەردەبرد. چەند باشە مرۆڤ ڕۆژانە سنوورێک بۆ بەزەیی بەخۆداهاتنەوەی دابنێت، کەمێک بگری و دواتر لەسەر ژیانی ئاسایی خۆی بەردەوام بێت. باشە ئەگەر مۆریی بەو حاڵ و تەندروستییە خراپەوە بتوانێت ئەوە بکات، ئەی ئێمە بۆ...

لەو بیرکردنەوانەدا بووم مۆریی پێگوتم: میچ، شتەکان تەنها

ئەو کاتە کارەساتن، کە پێتوایە کارەساتن. پێمناخۆشە دەبینم جەستەم بەهێواشی دەتوێتەوە و دواجاریش هیچی لێنامێنێتەوە، بەڵام لەهەمانکاتدا شتێکی خۆشیش هەیە ئەویش ئەوەیە کاتێکی زۆرم هەیە بۆماڵئاوایی.

کەمێک وەستا و ئینجا بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی: هەموو کەسێکیش ئەوەندە بەبەخت نییە.

مۆریی لەسەر عەرەبانەکەی بوو. بۆ ساتێک لێی وورد بوومەوە: ئەیدەتوانی هەستێتەسەرپێ، بچێتە سەرئاو، خۆی پاکبکاتەوە، هێشتاش بەخۆی دەگوت «بەبەخت»؟ تۆ بڵێی بەڕاستی بووبێت؟!



پشوویەکمان وەرگرت و مۆریی چوو بۆ سەرئاو، منیش چاوێکم گێڕا بە ڕۆژنامەکانی (بۆستن)دا، کە لەنزیکی کورسییەکەی (مۆریی) وە دانرابوون. هەواڵێکی تێدابوو لەسەر دوو کچی هەرزەکار، کە پیاوێکی حەفتاوسێ ساڵەیان ئەشکەنجەدابوو، پاشانیش کوشتبوویان و لەماڵی کابراشدا کردبوویان بە ئاهەنگ و شانازییان بەکارەکەیانەوە کردبوو. هەواڵێکیتری تێدابوو لەسەر دادگاییکردنی کەسێک، کەپیاوێکی هاوڕەگەزبازی کوشتبوو دوای ئەوەی کابرای هاوڕەگەزباز لەسەر تەلەفیزیۆن گوتبووی حەزی لە کابرای بکوژە.

ڕۆژنامەکانم خستەلاوە. وەک هەمیشە مۆریی بەخۆی و زەردەخەنەکەیەوە گەڕایەوە و کۆنیی ویستی لەسەر عەرەبانەکەیەوە بەرزیکاتەوە بۆ سەرجێگاکەی.

لێم پرسی: دەتەوێ من ئەوەیان بکەم؟

بۆ ساتێک هەموومان بێدەنگ بووین. خۆشم نازانم بۆ ئەو هاوکارییەم پێشکەشکرد. مۆریی سەیرێکی کۆنیی کرد و پێیگوت:

دەتوانی فێری بکەی ئەم ئیشە چۆن دەکرێ؟
کۆنیی وەڵامی دایەوە: بێگومان
کۆنیی چی پێگوتم ئەوەم کرد. نوشتامەوە و هەردوو دەستم خستە ژێرباڵی مۆریی، وەک ئەوەی لەبنەوە باوەش بەقەدەدارێکدا بکەم، ئینجا هەستامەوە و ئەویشم لەگەڵ خۆم هێنا.
بەشێوەیەکی ئاسایی، کاتێک کەسێک هەڵدەگری، چاوەڕێی ئەوە دەکەی قۆڵیان بەتوندی لەلەشت گیربکەن، بەڵام مۆریی نەیتوانی ئەوە بکات، چونکە کۆنترۆڵی بەسەر دەستەکانی و بگرە زۆربەی بەشەکانی جەستەیدا نەمابوو. هەستم بەسەری دەکرد، کە چۆن لەسەر شانم بەهێواشی دەهاتودەچوو، هەموو جەستەشیم وەکو پارچە سەمونێکی تەڕی گەورە بەخۆمەوە نوساندبوو.
بەدەنگێکی نزم هاواریکرد: ئاااخ
– تەواو، تەواو.
هەڵگرتنی مۆریی بەوشێوەیە کاریگەرییەکی وای لەسەر دروستکردم، کە نازانم چۆنی وەسف بکەم. هەرئەوەندە دەڵێم لەو هەڵگرتنەدا هەستم بە تۆوەکانی مردن دەکرد لە جەستە لاواز و کەمهێزەکەیدا. خستمەوە سەر جێگاکەی و سەریم لەسەر سەرینەکە جێگیرکرد، لەوکاتەدا بوو، کە هەستمکرد بەڕاستی ئەوەندەمان کات نەماوە بەیەکەوە.
زانیم دەبێت شتێک بکەم.

***

ساڵی ١٩٧٨ە و لەقۆناغی سێی زانکۆم. باوی دیسکۆ و زنجیرە فیلمەکانی ڕۆکییە. لەزانکۆی براندایس لەپۆلێکی کۆمەڵناسیی نائاساییدا کۆبووینەتەوە بۆ وانە خوێندن. مۆریی بەو وانانە دەڵێت «بەگرووپ کارکردن».

هەموو هەفتەیەک ئەوشێوازانەی مامەڵەکردن دەخوێنین، کە خوێندکارەکان لەنێوان یەکتریدا بەکاریان دەهێنن، هەروەها ئەوەش دەخوێنین چۆن ئەو خوێندکارانە مامەڵە لەگەڵ تووڕەیی و ئیرەیی پێبردن و و گرنگیی پێدان دەکەن. ئیتر بووین بە مشکی تاقیگە، زوو زوو یەکێکمان دەست دەکات بەگریان. من لای خۆمەوە کۆرسەکەم ناوناوە «کۆرسی سۆز و گریان». مۆریی پێمدەڵێت دەبێت کراوەتر بم.

لەم ڕۆژەدا، مۆریی داوامان لێدەکات ڕاهێنانێک بکەین. لە ڕاهێنانەکەدا دەبێت هەمووومان هەستینە سەرپێ و گرووپی دووکەسیی دروستبکەین، ئینجا یەکێکمان پشت بکاتە ئەویتر و خۆی بەپشتدا بخات، لەهەمانکاتدا چاوەڕێی کەسی بەرامبەر بێت بیگرێتەوە و نەهێڵێت بکەوێت. زۆربەمان حەزمان لەڕاهێنانەکە نییە. تۆزێک خۆمان دەنوشتێنینەوە و خێرا خۆمان دەگرینەوە، ئینجا بەشەرمەوە پێدەکەنین.

لەکۆتاییدا، یەکێک لەخوێندکارەکان، کە کچێکی لاوازی

بێدەنگی قژ ڕەشە و زۆربەی کات بلوزی سپی فش لەبەردەکات، هەردوو دەستی دەخاتەسەر سنگی، چاوەکانی دەنوقێنێت و خۆی بەپشتدا دەخات، دەکەوێت و هیچ هەوڵێک نادات خۆی بگرێتەوە، هەروەک ئەو کچە جوانانەی لەڕیکلامی چای لیپتۆندا لەشوێنێکی بەرزەوە خۆیان فڕیدەدەنە ناو ئاوێکی قوڵ و سەلامەت سەردەردێننەوە.

کچەکە خۆی بەپشتدا دەخات و منیش هەرچاوەڕێی ئەوەم بەر زەوییەکە بکەوێت، بەڵام لە ساتی کۆتاییدا بەرامبەرەکەی شان و سەری دەگرێت و بەتووندی بەرزی دەکاتەوە. زۆربەی خوێندکاران دەیکەنە هاوار و چەپڵەلێدان. مۆریی زەردەخەیەک دەیگرێت.

مۆریی ڕوودەکاتە کچەکە و دەڵێت: تۆ چاوت داخست. ئەوە جیاوازیەکە بوو. هەندێکجار مرۆڤ ناتوانێ باوەڕ بەوەبکات کە دەیبینێ، بۆیە دەبێ باوەڕ بەوە بکات، کە هەستی پێدەکات! کەواتە ئەگەر دەتانەوێ خەڵک متمانەتان پێبکات، دەبێ ئێوەش هەستی متمانەپێبوونتان بەرامبەر خەڵک هەبێ، تەنانەت کاتێک نازانن بارودۆخەکان چییان لێدێ، تەنانەت کاتێکیش خەریکە دەکەون!

## سێشەممەی سێیەم

## باسی پەشیمانیی دەکەین

سێشـەممەی دواتـر دیسـان بەخـۆم و عەلاگـە خواردنـەوە خۆمکردەوە بەماڵـی مۆرییـدا. ئەمجـارە پاسـتا بەگەنمەشـامی و زەڵاتـەی پەتاتـە و کێکێکـی سـێوم بـرد. یـەک شـتی تریـش: تۆمارکەرێکـی دەنگیـی لـە مارکـەی سـۆنی!

بـە مۆرییـم گـوت: بۆیـە ئەمـە تۆمارکـەرەم هێنـاوە بۆئـەوەی دواتـر بیرمبـێ باسـی چیمـان کـردووە. دەمـەوێ دەنگت تۆمـار بکـەم و دوایـی گوێـی لێبگرمـەوە.

- دوای مردنم؟
- شتی وا مەڵێ.

پێکەنی: میچ، من هەر دەمرم، ئەوەندەم نەماوە لێرە.

ئینجا سەیرێکی تۆمارکەرەکەی کردو و گوتی: گەورەشە!

لەوکاتـدا هەسـتمکرد، وەک هـەر پەیامنێرێکیتـر، سـنووری کەسـی مۆرییـم بەزانـدووە. تۆمارکـەرم لەنێـوان دوو هاورێـی وەک من و (مۆریی) دا وەک گوێیەکـی دەسـتکرد دەبینـی. پێموایـە لەنـاو ئـەو کەسـانەدا، کە سـەردانی مۆرییـان دەکـرد و دەیانویسـت کاتـی لەگـەڵ بەسـەربەرن، من لەهەموویـان زیاتـر هەوڵمـدەدا سـوود لـەو سێشـەممانە وەرگـرم.

تۆمارکەرەکـەم هەڵگـرت و گوتـم: ئەگـەر پێـی بێـزار دەبیـت،

بەکار....

قسەکەی پێبڕیم و بە پەنجەیەک عەینەکەکەی لەسەر لوتی هێنایە خوارەوە. عەینەکەکە بۆ چەند ساتێک لەسەر سنگی بەپەتەکەیەوە ڕاژەنی. سەیری ناوچاوی کردم و گوتی: داینێ. منیش دامنا. ئینجا بەدەنگێکی نزمتر بەردەوامبوو: میچ، تۆ تێناگەی! من دەمەوێ قسەت بۆ بکەم. دەمەوێ پێش ئەوەی بمرم دەربارەی ژیانم قسە بۆ تۆ بکەم. دەمەوێ یەکێک چیرۆکەکەی من ببیستێ، پێمبڵێ تۆ دەبی بەو یەکە؟

دوو، سێ جار سەرم بۆ لەقاند.

بۆ چەند ساتێک بەبێدەنگیی دانیشتین. ئینجا گوتی: ئەو شتە هەڵبووە؟



ڕاستییەکەی ئەو تۆمارکەرە تەنها بۆ ئەوە نەبوو دەنگی (مۆریی)م وەک یادگاریی لام بمێنێتەوە و تەواو، بەڕاستی خەریکبوو بەیەکجاری (مۆریی)م لەدەست دەچوو، هەموومان خەریکبوو (مۆریی)مان لەدەستدەچوو، من، خێزانەکەی، هاوڕێکانی، خوێندکارە کۆنەکانی، مامۆستاکانی هاوڕێی، ئەو دۆستە خۆشەویستانەی گفتوگۆی سیاسیی لەگەڵ دەکردن، ئەو کەسانەی سەمایان لەگەڵ کردبوو، هەموومان، منیش پێموابوو ئەو تۆمارە دەنگییە، وەک وێنە و پارچە ڤیدیۆییەکان، هەوڵێکیتری زیندووەکانە بۆ دزینی شتێک لە جانتای مردن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە مۆریی چاوەڕوانی مردنی دەکرد بێت ببیات، لام ئاشکرابوو بەهۆی ئازایەتی و قسەخۆشیی و ئارامگریی و کراوەییەکەیەوە لەهەموو ئەو کەسانەی دەمناسین جیاوازتر د

لەگۆشەنیگایەکی تـرەوە سـەیری ژیانـی دەکـرد، گۆشـەنیگایەکی جوانتـر و ژیرانەتـر! دیاربـوو نزیکبوونـەوە لەمـردن شـتێکی گـەورەی لـەلای مۆریـی ڕوونکردبۆوە و ئەویش دەیویست ئـەو شـتە بداتـەوە بـە زینـدووەکان. بێگومـان منیش دەمویسـت ئـەو شـتە بزانـم و تاهەتایـەش بیـرم نەچێتـەوە.



یەکەمجـار کـە (مۆریـی)م لە بەرنامـەی (نایت لاین)دا بینی، یەکسەر بیـرم چـوو بـۆلای ئـەوەی دەبێـت ئێسـتا مامۆسـتا کۆنەکەم لە چ شـتێک پەشـیمان بێـت کاتێـک دەبینێـت مـردن بەڕاسـتی نزیکبۆتـەوە. بڵێـی خەفـەت بـۆ ئـەو ئازیزانـەی بخـوات، کـە لێیـان دوورکەوتۆتـەوە؟ بڵێـی ئێسـتا حەزبـکات شـتەکانی بەشـێوەیەکیتر بکردایە؟ بەخۆپەرسـتییەوە لەخۆمـم پرسـی: میـچ، ئەگـەر تـۆ لەشـوێنی ئـەو بویتایـە خەفەتـت بـۆ ئـەو شـتانە دەخـوارد، کـە لەدەسـتت داون؟ پەشـیمان دەبوویتـەوە لـە نەدرکاندنـی ئـەو نهێنیانـەی نەتدرکانـدوون؟

کاتێـک ئەمـەم بـۆ مۆریـی باسـکرد، سـەرێکی لەقانـد و گوتـی: هەموو کەسێک هـەر خەمـی ئەمەیەتـی، وانییـە؟ بەخۆیـان دەڵێـن: باشـە ئـەی ئەگـەر ئەمـڕۆ دوا ڕۆژی ژیانـم بوایـە، چـی؟

مۆریـی تـەواو دەموچـاوی خوێندمـەوە و پێموابێـت لەوەش تێگەیشـت، کـە نەمدەزانـی هەسـتەکانم چـۆنـن لەوکاتـەدا. سـەبارەت بـە مردنـی خۆشـم، خۆمـم هاتەبەرچـاو ڕۆژێـک لەکاتـی ئامادەکردنـی هەواڵێکـدا بەسـەرمێزەکەمدا دەکـەوم و لەکاتێکـدا تیمـی پزیشـکیی دەمفڕێنـن بـۆ نەخۆشـخانە، بەڕێوەبەرەکـەم خێـرا بەدزییـەوە لاپـەڕەی هەواڵـەکان لەژێردەسـتم دەردەهێنێـت.

مۆریی لەپڕ بانگی کردم: میچ؟

سەرێکم لەقاند و هیچم نەگوت، بەڵام مۆریی تێگەیشت شڵەژاوم.
دەستیپێکردەوە: میچ، ئێمە هەتا خەریک نەبێ بمرین، کولتوورەکەمان هانی ئەوەمان نادا بیر لەمجۆرە شتانە بکەینەوە. ئێمە زۆر بیر لەخۆمان دەکەینەوە، لە ئیشەکەمان، لە خێزانەکەمان، لە پەیداکردنی پارە، لە دابینکردنی قیستی خانوو، لە کڕینی سەیارەی تازە، لە چاککردنەوەی کەلوپەلەکانی ناو ماڵەکەمان و لە چەندین شتیتری تایبەت بە خۆمان و ژیانمان. هەموو ئەمانەی ئەنجامیاندەدەین تەنها بۆئەوەن بەردەوام بین لەژیان، هەرلەبەر ئەمەشە فێری ئەوە نابین لەخاڵێکدا بوەستین و ئاوڕێک لەژیانمان بدەینەوە و بەخۆمان بڵێین: تەواو، ئەمە هەمووی بوو؟!، یان لەخۆمان بپرسین: ئەمە هەموو ئەو ژیانە بوو، کە هەوڵم بۆدەدا و دەمویست؟ بڵێی شتێک لەجێی خۆی نەبێ و من نەیزانم؟
ئەو قسانەی کرد و کەمێک وەستا، ئینجا گوتی: میچ، مرۆڤ دەبێ یەکێک بدۆزێتەوە بۆ ئەو ڕێگایە ڕێبەریی بکات. ئەو شتە هەر لە خۆیەوە ڕوونادا.
چاک دەمزانی مۆریی باسی چی دەکات.
هەموومان پێویستمان بە مامۆستایە لە ژیانماندا. مامۆستاکەی من لەبەردەمی خۆمدا بوو.

***

دوای بیرکردنەوە، بەخۆمم گوت: زۆرباشە، ئێستا کاتی ئەوەیە بیگەم. ئەگەر من ئەوەندە بەبەخت بم و ئەو خوێندکارە بم، کە مۆریی لێی تێگەیشتووە، دەبێ ببمە خوێندکارێکی باش.
ئەو ڕۆژە کە گەڕامەوە بۆ ویلایەتەکەی خۆم، هەر لە فڕۆکەکەدا لەسەر پارچە کاغەزێکی زەرد لیستێکم دروستکرد

لەو شتانەی لەژیانماندا تێگەیشتنیان بەلای زۆربەمانەوە قورسە. لە «ئاسوودەیی»ەوە بۆ «بەساڵاچوون» و لەوێوە بۆ «منداڵ هەبوون» و «مردن».

بێگومان لەسەر ئەم بابەتانە هەزارەها کتێب و چەندین بەرنامەی تەلەفیزیۆنیی و دانیشتن لەگەڵ کەسانی پسپۆڕ هەبوون. ئەمەریکا بۆ بابەتی یارمەتیدانی خوود وەک بازاڕێکی ئێرانی لێهاتبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ وەڵامێکی ڕوون و ئاشکرا لەبەردەست نەبوون لەسەر ئەو بابەتانە.

ئایا گرنگیی بە خەڵک دەدەیت، یان تەنها خزمەتی منداڵەکەی ناو خۆت دەکەیت؟ دەگەڕێیتەوە بۆ کولتووورە تەقلیدییەکان یان هەموو بیر و کردارە تەقلیدییەکان، بەبێبەها تەماشادەکەیت؟ بەدوای سەرکەوتندا ڕادەکەیت، یان بەدوای سادەییدا؟ هەر ئەوەیە بەدەم دەڵێی «نەخێر» یان ئەوەی دەتەوێت بەکرداریی ئەنجامی دەدەیت؟ هەموو ئەوەی دەمزانی ئەمە بوو: مۆریی، مامۆستا کۆنەکەم، لەوەدا نەمابوو هەوڵبدا زیاتر بژی، لەبەردەرگای مردن وەستابوو، گوێی هەڵخستبوو فیکەکەی بۆ لێدا و بڕوا.

مۆریی لەم قۆناغەی نەخۆشییەکەیدا بۆی ڕوون ببۆوە لەژیاندا چی گرنگە و چی گرنگ نییە! منیش دەمویست بگەمە ئەوە. لەتەواوی ژیانمدا هەر کەسێکم بینیبێت و ناسیبێت هەر ئەمەی ویستووە: بۆی ڕوون بێتەوە چی گرنگە و چی گرنگ نییە.

مۆریی هەمیشە ئەمەی پێیدەگوتم: چ پرسیارێکت هەیە بیکە؟ بۆیە منیش ئەم لیستەم دروستکرد تا لەگەڵ مۆریی گفتوگۆ لەسەر یەکە یەکەیان بکەین:

مردن

ترس

**پیربوون**
**چاوچنۆکیی**
**هاوسەرگیریی**
**خێزان**
**کۆمەڵگا**
**لێخۆشبوون**
**ژیانێکی مانادار**

کاتێک بۆ چوارەمجار گەڕامەوە وێست نیوتن بۆ لای مۆریی، لیستەکە لەجانتاکەمدابوو. ئەو ڕۆژەی گەڕامەوە سێشەممەی کۆتایی مانگی ئاب بوو. سیستمی فێنککەرەوەی فڕۆکەخانەکە تێکچووبوو، خەڵک خۆیان باوەشێن دەکرد و بە توورەییەوە خێراخێرا ئارەقیان دەسڕی. سەیری هەردەموچاوێکم دەکرد غەزەبی لێدەباری.

❊❊❊

لە قۆناغی چواری زانکۆم، لەو سێ ساڵەی پێشوودا زۆربەی ئەو وانانەم خوێندووە، کە پەیوەندییان بە کۆمەڵناسییەوە هەبووە. تەنها ئەمساڵم ماوە و دوای ئەوە بڕوانامەکە بەدەستبهێنم. مۆریی پێشنیاری ئەوەم بۆ دەکات دەست بەکارکردن بکەم لەسەر توێژینەوەی دەرچوونەکەم.

پێی دەڵێم: بەڵام نازانم لەسەر چ بابەتێک بنووسم؟

وەڵامم دەداتەوە: هەرچییەکت حەز لێیە لەسەر ئەوە.

دەیهێنین و دەیبەین تا دواجار لەسەر بابەتێک ڕێکدەکەوین. لەناو ئەو هەموو بابەتەدا بڕیاردەدەم لەسەر وەرزش بنووسم.

پاش ماوەیەکی کەم پرۆژەیەکی یەک ساڵیی دەستپێدەکەم لەسەر ئەوەی چۆن یاری تۆپی پێ لە ئەمەریکادا بۆتە یارییەکی ئەوەندە بڵاو، کە تەنانەت وەک بۆنەیەکی ئاینیی، یان تریاکی کۆمەڵگای لێهاتووە. تا ئەوکاتەش نازانم، کە لەڕاستییدا ئەم پرۆژەیە ڕاهێنانە بۆ پیشەی داهاتووی ژیانم یان نا. تەنیا ئەوەندە دەزانم ئەم کارەم دەرفەتی ئەوەم دەداتێ بەردەوام بم لەسەر دانیشتنە هەفتانەییەکانم لەگەڵ مۆریی.

بەیارمەتی مۆریی، تا بەهاری ئەو ساڵە توێژینەوەیەکی سەد و دوانزە لاپەڕەیی دەنووسم، کە هەموو زانیارییەکانی ناویم بە گەڕان دۆزیوەتەوە و ئاماژەشم بەسەرچاوەکانیان کردووە لە کۆتایی

توێژینەوەکەدا. بەرگێکی چەرمم تێگرتووە و توێژینەوەیەکی ڕێکوپێکە.

وەک یاریزانێکی بەیسبۆڵ، کە یەکەم گۆڵی بردنەوەی کردبێت، دێمە بەردەم مۆریی و توێژینەوەکەمی نیشان دەدەم.

یەکسەر پێمدەڵێت: پیرۆزە، پیرۆزە!

ئەو پەڕەکان هەڵدەداتەوە و منیش لەجێی خۆمەوە زەردەخەنە دەکەم، چاو بە ژوورەکەیدا دەگێڕم، لەڕەفەی کتێبەکان و زەویە تەختەکە و فەرشەکە و قەنەفەکە ورد دەبمەوە. لەپڕ ئەوە دێتە خەیاڵم، کە من لەم ژوورەدا شوێن نییە لێی دانەنیشتبم.

مۆریی بەدەم ڕێککردنی عەینەکەکەیەوە دەڵێت: نازانم بڵێم چی میچ! ئەم کارەت ئەوەندە باشە ناچارمان دەکات وەرتبگرینەوە بۆ خوێندنی ماستەر و دکتۆرا.

منیش دەڵێم: مۆریی گیان، من و ماستەر و دکتۆرایان نەگوتووە!

ڕاستە من گاڵتەم بە مەسەلەکە دێت، بەڵام لەلایەکیشەوە شتەکە ئەوەندەش کەم نییە.

بەشێکم لە دەرچوون لەزانکۆ دەترسێت و بەشێکیشم تامەزۆری ئەوەیە دەربچم و بڕۆم. دووبارە مەسەلەی دوو شتە دژبەیەکەکە لەمێشکمدا سەرهەڵدەداتەوە! مۆریی توێژینەوەکەم دەخوێنێتەوە و منیش سەیری دەکەم، لەدڵی خۆمدا بیر دەکەمەوە دەبێ ژیانی دوای دەرچوون لەزانکۆ چۆن بێت!

# بەرنامە تەلەفیزیۆنییەکە
## بەشی دووەم

دەرکەوتنی مۆریی لەبەرنامەکەی (تێد کۆپێل)دا و ئەو پێشوازییە گەرمەی لەبەرنامەکە کرا، وایکرد ئامادەکارەکانی بەرنامەی نایت لاین بۆجاری دووەم چاوپێکەوتن لەگەڵ مۆریی بکەن. لەجاری دووەمدا وێنەگرەکان و ئامادەکارانی بەرنامەکە کاتێک خۆیانکرد بە ژووردا وەک ئەندامی خێزانەکە وابوون، کۆپێل خۆشی زۆر لەجاری یەکەم ڕووگەشتربوو. مۆریی و تێد پێش ئەنجامدانی چاوپێکەوتنە سەرەکییەکە هیچ ئامادەکارییەکیان نەکرد، لەجیاتی ئەوە هەندێک چیرۆکیان لەسەر منداڵیی خۆیان بۆیەکتری گێڕایەوە. کۆپێل باسی گەورەبوونی خۆی کرد لە ئینگلتەرا و مۆرییش باسی گەورەبوونی خۆی کرد لە برۆنۆکس.

مۆریی کراسێکی شینی قۆڵدرێژی لەبەربوو، زۆربەی کات سەرمای بوو، تەنانەت ئەو کاتەش، کە لەدەرەوە پلەی گەرما چل بوو، بەڵام کۆپێل چاکەتەکەی داکەند و بەکراس و بۆینباخەوە چاوپێکەوتنەکەی دەستپێکرد. وادیاربوو مۆریی چین چین کۆپێل هەڵداتەوە، هەر چاوپێکەوتنە و چینێک.

کامێراکە کەوتەکار و کۆپێل بە مۆریی گوت: باش دیاریت.

– هەموو هەر وام پێدەڵێن.

- دەنگەکەشت باشە.
- هەموو هەر وام پێدەڵێن.
- ئەی کەواتە بەچیدا دەزانی بەرەو کۆتایی دەڕۆی؟

مۆریی ئاهێکی هەڵکێشا: تێد، جگە لە خۆم کەس ئەوە نازانی، بەڵام من بۆخۆم دەزانم، کە ئەوەندەم نەماوە.

بەو قسە و جوڵانەدا، کە دواتر کردنی شتەکە لای ئێمەش ڕوون بۆوە، ئەمجارەیان مۆریی نەیدەتوانی وەک جاری پێشوو بە دڵی خۆی دەست بجوڵێنێت، هەندێ وشەی بە قورسی بۆ گۆدەکران و جارجاریش دەنگی نەدەهاتەدەر. لەوەدەچوو دوای چەند مانگێکی کەم بەتەواوی لەقسەکردن بکەوێت.

مۆریی بە کۆپێڵی گوت: هەستەکانم بەمشێوەیەن، کە ئێستا پێتدەڵێم. کاتێک هاوڕێ و خەڵکیتر دێن بۆ لام، زۆر باشم، ئەو پەیوەندییانەی کە خۆشەویستییان تێدایە دڵخۆش و گەشبینم دەکەن، بەڵام باهەڵیشت نەخەڵەتێنم، هەندێک ڕۆژیش خەمێکی زۆر دامدەگرێ، هەندێک شت دەبینم ڕوودەدەن و دەترسم. بەخۆم دەڵێم: باشە دەستەکانم لە ئیش بکەون چی بکەم؟ ئەی ئەگەر لەدەم کەوتم چی؟ من زۆر گرنگیی بە قوتدان و خواردن نادەم بۆیە لەڕێگەی سۆندەشەوە خواردنم بدەنێ کێشەم نییە، بەڵام دەنگەکەم نەمێنێ چی بکەم؟ دەستەکانم لە ئیش بکەون حاڵم باش نابێ، تێد؟ دەم و دەست دوو بەشی زۆر گرنگن لەمن، بە دەنگم قسە دەکەم و بەدەستەکانیشم جووڵە. من بەم دوانە پەیوەندی لەگەڵ خەڵک و دەورووبەردا دەکەم.

کۆپێڵ لێی پرسی: ئەو کاتەی ئیتر قسەت بۆ ناکرێ چۆن پەیوەندی لەگەڵ دەورووبەرەکەت دەکەی؟

مۆریی شانێکی هەڵتەکاند و گوتی: بەڕاستی نازانم، ڕەنگە دلوا

بکەم تەنها پرسیاری (بەڵێ) و (نەخێر)م لێبکەن.

وەڵامەکەی مۆریی ئەوەندە سادە بوو کۆپێل پێکەنی. ئەمجارە کۆپێل پرسیاری لە مۆریی کرد لەسەر بێدەنگیی و بەباسی ماوری ستەین دەستیپێکرد، ئەو هاوڕێ خۆشەویستەی مۆریی بوو، کە وتەکانی مۆریی گەیاندبووە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بۆستن گلەوب.

مۆریی و ماوری لەسەرەتای شەستەکانەوە لەزانکۆی براندایس پێکەوە مامۆستا بوون. ماوەیەک لەوەوبەر بەهۆی نەخۆشییەوە ماوری کەڕ ببوو. کۆپێل هێنایە بەرچاوی خۆی ڕۆژێک ئەو دوانە یەکتر ببینن، یەکێکیان ناتوانێت قسە بکات و ئەوی تریشیان کەڕە. تۆ بڵێی چی دەرچێت؟

مۆریی زۆر بەسادەیی وەڵامی کۆپێلی دایەوە: تێد گیان، دەستی یەکتر دەگرین و دونیایەک خۆشەویستی ئاڵوگۆڕ دەکەین. من و ماوری سی و پێنج دانە ساڵە هاوڕێین. مرۆڤ بۆئەوەی هەست بە سی و پێنج ساڵ هاوڕێیەتی بکات پێویستی بە قسە و بیستن نییە!

لەدوای بەشی یەکەمی بەرنامەکەوە، مۆریی ژمارەیەکی زۆر نامە و ئیمەیڵی بۆ هاتبوو. پێش ئەوەی چاوپێککەوتنی دووەم تەواو ببێت، مۆریی یەکێک لە نامەکانی بۆ کۆپێل خوێندەوە. نامەکە لە ویلایەتی (پەنسلڤانیا)وە لەلایەن مامۆستایەکەوە نێردرابوو، کە وانەی تایبەتی بە پۆلێکی نۆ خوێندکاریی دەگوتەوە. هەر یەک لەو منداڵانەی لەو پۆلەدا بوون، یان دایکیان نەمابوو، یان باوک. مۆریی بەوریاییەوە عەینەکەکەی خستە سەر لوتی و بە کۆپێلی گوت: گوێبگرە بزانە چیم وەڵامی ئەو مامۆستایە داوەتەوە.

مامۆستا باربارای ئازیز

نامەکەت زۆر کاری تێکردم. هیچ گومانم نییە ئەوەی تۆ بۆ ئەو منداڵە بێ دایک، یان بێ باوکانەی دەکەی ئێجگار گرنگ و پیرۆزە. منیش هەر منداڵبووم، کە دایکم مرد...

کامێراکان وێنەیان دەگرت. مۆریی دەستێکی برد بۆ عەینەکەکەی و کەمێک جوڵاندی. ئینجا لەقسەکردن وەستا و لێوی خۆی گەست. مۆریی قورگی پڕ بوو لە گریان و ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتنەخوار. بەگریانەوە بەردەوامبوو لە خوێندنەوەی نامەکە: منیش هەر منداڵبووم کە، دایکم مرد. بەڕاستی کارەساتێکی ئێجگار قورس و ناخۆش بوو لەسەرم. خۆزگە منیش پۆلێکی وەک ئەوەی تۆم دەستبکەوتایە تا تیایدا باسی ئازارەکانی خۆم بکەم. مامۆستا باربارا، بڕوابکە حەزمدەکرد منیش لەو پۆلەی تۆدا بوومایە لەبەرئەوەی....

گریانەکە تەواو قورگی مۆریی گرت: لەبەرئەوەی مردنی دایکم زۆر تەنیای کردم.

کۆپێل لێی پرسی: مۆریی، تۆ حەفتا دانە ساڵ پێش ئێستا دایکت مردووە! تائێستاش ئاوا ئازارت دەدا؟

مۆریی بەدەنگێکی نزم وەڵامی دایەوە: بێگومان!

# مامۆستاکە

تەمەنی هەشت ساڵ بوو. پەیامێکیان لە نەخۆشخانەوە پێگەیشت. لەبەرئەوەی باوکی پەناهەندەیەکی ڕوسیی بوو نەیدەتوانی ئینگلیزی بخوێنێتەوە، دەبوو مۆریی هەواڵەکە ئاشکرا بکات. وەکو خوێندکارێک هەستابێتە سەرتەختە دەستیکرد بە خوێندنەوەی بەڵگەنامەی مردنی دایکی: بەداخ و پەژارەیەکی زۆرەوە پێتان ڕادەگەیەنن، کە...

ئەمە یەکەم ڕستەی ناو نامەکە بوو.

لەبەیانی ڕۆژی بەخاکسپاردنەکەدا، خزمان هاتن بۆ ماڵی مۆریی، کە لە باڵەخانەیەکدابوو لەناو بەشە هەژارەکەی مانهاتن. پیاوەکان قاتی ڕەشیان لەبەردابوو، ژنەکانیش سەرپۆشی ڕەشیان کردبوو. منداڵانی گەڕەک بەڕێگاوە بوون بۆ قوتابخانە، کاتێک بەلای مۆرییدا تێپەڕین، مۆریی سەریداخست و شەرمیدەکرد لەوەی هاوپۆلەکانی بەوشێوەیە بینیویانە. یەکێک لە پورەکانی کە ژنێکی کەڵەگەت بوو، باوەشی بە مۆرییدا کردو و بەگریانەوە گوتی: مۆریی گیان، ئاخر ئێستا چی دەکەی بەبێ دایکت؟ چیت لێدەردەچێ تۆ؟

مۆرییش دەستیکرد بە گریان. هاوپۆلەکانی ڕایانکرد.

لە گۆڕستانەکە، مۆریی لەنزیکەوە سەیری گۆڕی دایکی دەکرد کاتێک خۆڵەکەیان تێدەکردەوە. هەوڵیدا ئەو ساتە جوان و ناسکانە بیرخۆی بێنێتەوە، کە لەگەڵ دایکی بەسەریبردبوون.

دایکی مۆریی تا ئەوکاتەش، کە نەخۆش کەوت، لەسەر دوکانێکی شیرینی بوو، بەڵام دوای ئەوەی نەخۆشی بەرۆکی گرت، زۆربەی کاتەکانی بە خەوتن، یان دانیشتنەوە لەبەر پەنجەرەی ژوورەکان بەسەردەبرد. تەواو لاواز و بێهێز ببوو. هەندێکجار هاواری لە کوڕەکەی دەکرد دەرمانەکانی بۆ بەرێت، مۆریی منداڵیش، کە هێشتا خەریکی یاریکردن بوو لەکۆڵان، خۆی لێ کەڕ دەکرد. لەمێشکی خۆیدا وابیری دەکردەوە ئەگەر نەخۆشییەکەی دایکی پشتگوێ بخات، نەخۆشییەکە نامێنێت و دایکی چاک دەبێتەوە، ئاخر منداڵ لەو ڕێگایە زیاتر بە چ ڕێگایەکیتر دەتوانن ڕووبەڕووی مردن ببنەوە؟

باوکی مۆریی کە هەموو بە (چارلی) بانگیان دەکرد، لەترسی خزمەتی سەربازی لە سوپای ڕوسیادا بەناچاری بەرەو ئەمەریکا هەڵهاتبوو. ئیشی کڕین و فرۆشتنی فەرووی دەکرد، بەڵام زۆربەی کات بێکار بوو. نە خوێندبووی، نە ئینگلیزیشی دەزانی، لەبەرئەوە زۆر هەژاربوو. خێزانەکەی زۆربەی کات لەسەر خێری خەڵک دەژیان. شوقەکەیان پشتی بە پشتی دوکانی شیرینییەکەوە بوو، شوێنێکی تاریکی پڕ درزی ناخۆش بوو. ماڵی مۆریی هیچیان نەبوو ژیانیان خۆش و ئاسان بکات، نە سەیارە، نە هیچ. هەندێکجار بۆ پەیداکردنی پارە، مۆریی و برا بچووکەکەی، کە ناوی دەیڤد بوو، بە پێنج سەنت بەردەرگای ماڵانیان دەشت.

دوای مردنی دایکیان، دوو براکە نێردران بۆ ئوتێلێک لە ویلایەتی کۆنێکتیکت. لەوێ بە چەند خێزانێک یەک کابینەی گەورە د مەتبەخێکی هاوبەشیان دەستکەوت. خزمەکانیان دەیانگوت: ئەوێ هەواکەی پاکە و بۆ منداڵەکان باشە!

مۆریی و دەیڤد پێشتر لەژیانیاندا هەرگیز ئەوەندەیان سەوزایی

نەبینیبوو. ڕایان دەکرد و لە کێڵگەکاندا یارییان دەکرد. شەوێکیان دوای نانی ئێوارە، دوو برا پێکەوە چوون بۆ پیاسە و پاش کەمێک باران دایکرد، بەڵام لەجیاتی ئەوەی بێنەوەماڵەوە، چەند سەعاتێک لەدەرەوە سووڕانەوە. بۆ سبەینێ کاتێک لەخەو هەستان، مۆریی بەدڵێکی خۆشەوە لەجێگاکەی دەرپەڕی و بە براکەی گوت: دەی هەستە، هەستە خێرا.

- ناتوانم

- ناتوانم چییە! هەستە دەی.

دەیڤید بەدەموچاوێکی تۆقیوەوە گوتی: ناتوانم. لەجێی خۆم جوڵەم بۆ ناکرێ.

دەیڤد توشی ئیفلیجی ببوو. بێگومان هۆکار بارانەکە نەبوو، بەڵام منداڵێکی وەک مۆریی لەوکاتەدا لەوە تێنەدەگەیشت. تا ماوەیەکی زۆر دەیڤد بەردەوام دەبرا بۆ نەخۆشخانە و دەهێنرایەوە. دوو ئاسنیان لەقاچی بەست، کە وایاندەکرد لەکاتی ڕۆیشتندا بشەلێت.

بەدرێژایی ئەم ماوەیە مۆریی لەبەرامبەر حاڵی براکەیدا هەستی بە لێپرسراوێتیەکی گەورە دەکرد، بەیانیان دەڕۆیشت بۆ پەرستگای تایبەتی جولەکەکان، بەتەنیا دەڕۆیشت لەبەرئەوەی باوکی پیاوێک نەبوو بڕوای بە ئاین هەبێت، لەوێ لەنێوان ئەو پیاوانەدا دەوەستا، کە بەخۆیان و قەمسەڵە درێژە ڕەشەکانیانەوە وەک دارێکی بەرز دەشنانەوە، دەوەستا و لەخوا دەپاڕایەوە بەزەیی بە دایکە کۆچکردووەکەیدا بێتەوە و برا نەخۆشەکەشی چاک بکاتەوە.

لەدوانیوەڕۆیانیشدا مۆریی لە وێستگەی شەمەندەفەرەکە دەوەستا و گۆڤاری دەفرۆشت. چی دەستدەکەوت دەیدا بە خێزانەکەی بیدەن بەخواردن. ئێوارانیش سەیری باوکی دەکرد، کە چۆن بەو پەڕی بێدەنگییەوە نانی دەخوارد. مۆریی هەمیشە ئاواتی دەخواست باوکی

کەمێک سۆز و خۆشەویستیی بۆ دەربڕێت، بەڵام ئەو خۆزگەیەی هەرگیز نەهاتەدی.

لەتەمەنی نۆ ساڵیدا، مۆریی هەستیکرد بارێکی زۆر قورس کەوتۆتە سەرشانی، بەڵام خۆشبەختانە دوای ساڵێک باوەشیک کرایەوە: باوەشی (ئیڤا)ی باوەژنی.



ئیڤا پەنامەندەیەکی ڕۆمانیی باڵاکورت بوو. دەموچاوێکی ئاسایی و قژێکی قاوەیی لولی هەبوو، لەگەڵ هێز و توانای دوو ژن. بەمامەڵەکردنە خۆشەکەی تاڕادەیەکی زۆر ئەو کەشە تاریکەی ڕوونـاک کردەوە، کە باوکی مۆریی لەماڵەکەدا دروستی کردبوو.

ئیڤا تا مێردە تازەکەی بێدەنگ نەبووایە قسەی نەدەکرد، شەوانیش گۆرانی بۆ منداڵەکان دەگوت و بەدەنگە ئارامکەرەوەکەی ئامۆژگارییەکانی و کەسایەتییە بەهێزەکەی دڵی مۆریی خۆشدەکرد. کاتێک دەیڤد، کە هێشتا ئاسنەکان هەر بەقاچییەوە بوون، لە نەخۆشخانە دەرچوو، لەگەڵ مۆریی بەتەنیشت یەکەوە لەسەر هەمان جێگا لە مەتبەخەکە دەخەوتن. هەموو شەوێک پێش خەوتن ئیڤا دەچوو بۆ لایان و ماچی دەکردن. چۆن بەچکە سەگێکی بچووک چاوەڕێی شیر دەکات، مۆریی ئاوا چاوەڕێی ئەو ماچانەی دەکرد.

مۆریی دووبارە لەقووڵایی ناخییەوە هەستیکرد دووبارە دایکی هەیە.

هەژاری بەرۆکی خێزانەکەی بەرنەدەدا. ئێستا ماڵی مۆریی لە برۆنکس دەژیان، لە شوقەیەکی دوو ژووریدا، کە بەخشتی سوور دروستکرابوو. شوقەکە لەسەر شەقامی تێرمۆنت بوو، لە تەنیشتیشیەوە باخچەیەکی بیرە دروستکردنی ئیتاڵیەکانی لێبوو،

کە تیایدا ئێوارانی هاوین بەساڵاچووان یاری بۆوڵینی سەرچیمەنیان لێدەکرد.

بەهۆی گرانییە گەورەکەی ئەمەریکاوە، کاری باوکی مۆریی زیاتر ڕووی لە کزی کردبوو. هەندێکجار کاتێک خێزانەکە بۆ نانی ئێوارە کۆدەبوونەوە، لە نانی وشک زیاتر هیچیتر نەبوو ئیڤا بیخاتەسەر سفرە. هەمووجارێکیش دەیڤد دەیپرسی: چیترمان هەیە؟

ئیڤاش وەڵامی دەدایەوە: هیچیتر.

کاتێک ئیڤا مۆریی و دەیڤدی دەبردە سەر جێگاکەیان، بەزمانی (یەدی) گۆرانی بۆ دەگوتن. ئیڤا تەنانەت گۆرانییەکانیشی هەژارانە و دڵتەنگکەر بوون. یەکێک لە گۆرانییەکان باسی کچێکی جگەرەفرۆشی دەکرد:

تتوخوا جگەرەیەکم لێبکڕن.
جگەرەکانم وشکن
باران تەڕی نەکردوون
بەزەییتان پێمدابێتەوە
بەزەییتان پێمدابێتەوە.

سەرەڕای ئەو بارە ناهەموارەی خێزانەکەی پێدا تێدەپەڕی، مۆریی فێری خۆشەویستی و گرنگیی پێدان بوو. لەقوتابخانەشدا ئیڤا لە پلەی «نایاب» کەمتری قبوڵ نەبوو، چونکە خوێندنی وەک تاکە ڕێگا دەبینی بۆ ڕزگارکردنی خێزانەکە لەهەژاریی. خۆشی دەچوو بۆ قوتابخانەی ئێواران بۆ ئەوەی ئینگلیزییەکەی باش بکات.

لەڕاستیدا، مۆریی بەهۆی ئیڤاوە حەزی لە خوێندن کرد. شەوان لەبەر ڕووناکی چرایەک لەسەر مێزی نانخواردنەکەی مەتبەخ سەعی دەکرد. بەیانیانیش دەچوو بۆ پەرستگا بۆ نزاکردن بۆ

دایکە کۆچکردووەکەی. مۆریی لەلایەن باوکییەوە ئاگادار کرابۆوە، کە هەرگیز باسی دایکی نەکات بۆ ئەوەی دەیڤد هەروا بزانێت، کە ئیڤا دایکی ڕاستەقینەیەتی. لەگەڵ ئەمەشدا مۆریی بۆ زیندوو هێشتنەوەی یادگارییەکانی دایکی ئامادە نەبوو واز لە سەردانکردنی پەرستگا بهێنێت، بەڵام بەڕاستی ئەوە بارێکی گران بوو لەسەر مۆریی. بۆ ماوەی چەندساڵێکی زۆر، تاکە شتێک کە مۆریی لەدایکییەوە بۆی بەجێمابوو بەڵگەنامەی مردنەکەی بوو. لەو ڕۆژەوەی بەدەستیان گەیشت لای خۆی شاردبوویەوە و بۆ هەتاهەتایەش لای خۆی پاراستی.



لەسەردەمی قاتوقڕییە گەورەکەی ئەمەریکادا کاتێک مۆریی هەرزەکار بوو، ڕۆژێک باوکی لەگەڵ خۆی بردی بۆ ئەو کارگەی فەرووەی کاری لێدەکرد. چارلی دەیویست کارێک بۆ مۆریی پەیدا بکات.

مۆریی چووەناو کارگەکەوە و دەستبەجێ هەستیکرد لەشوێنێکدایە هەرچوارلای گیراوە و هیچ دەرگایەکی نییە مرۆڤ لێوەی ڕابکات. ژوورەکە گەرم و تاریک بوو، جامی پەنجەرەکان چەندین چین پیسییان لەسەر نیشتبوو، مەکینەکان بەقاییمی پێکەوە بەسترابوون و وەکو سکە و تایە ئاسنەکانی شەمەندەفەر بەیەکدا چووبوون، پارچەی بچووکی فەرووەکان بەرز دەبوونەوە و هەوای ژوورەکەیان خەست دەکردەوە، کرێکارەکانیش بەسەر دەرزییەکانیاندا چەمابوونەوە و خەریکی شت دروون بوون. خاوەنی کارگەکەش زوو زوو دەردەکەوت و بەناو ڕیزەکاندا دەهاتودەچوو، هاواری بەسەر کرێکارەکاندا دەکرد و پێی دەگوتن خێراتر کاربکەن. مۆریی بەئاستەم هەناسەی بۆ دەدرا.

بەنرسێکی زۆرەوە لەتەنیشت باوکییەوە وەستابوو، هەر لە خوا دەپاڕایەوە خاوەن کارگەکە هاوار بەسەر ئەویشدا نەکات.

لەپشووی نانخواردنی نیوەڕۆدا، چارلی مۆریی برد بۆلای خاوەن کارگەکە و داوای لێکرد ئەگەر کارێک هەبێت بۆ مۆریی کوڕی بیداتێ. لەڕاستیدا، کار بۆ گەورەکانیش نەبوو ئینجا بۆ بچووکەکان. کەسیش ئامادەنەبوو لەدۆخێکی ئاوادا واز لە ئیشەکەی بهێنێت.

ئەو هەواڵە بۆ مۆریی خەلاتێکی خوایی بوو، چونکە مۆریی زۆر ڕقی لە شوێنەکە دەبۆوە، بۆیە هەر لەوێدا بەڵێنێکی تری بەخۆیدا، کە تا کۆتایی ژیانی بردیەسەر. بەخۆی گوت: بەڵێن بێ هیچ کات کارێک نەکەم چەوساندنەوەی کەسێکی تری تێدابێ، هەرگیز ڕێگە بەخۆم نەدەم لەسەر ئارەق و هیلاکی یەکێکیتر گیرفانم پڕ بکەم.

ئیڤا جارجار لە مۆریی دەپرسی: کە گەورە بووی حەزدەکەی ببی بەچی؟

مۆرییش دەیگوت: نازانم.

مۆریی حەزی لەپارێزەریی نەبوو لەبەرئەوە نەیدەویست بچێتە کۆلێژی یاسا. لە خوێنیش دەترسا، لەبەرئەوە حەزی لە کۆلێژی پزیشکییش نەبوو.

ئیڤا دووبارە لێی دەپرسی: ئەی کەواتە دەتەوێ ببی بەچی؟

ئەوەبوو دواتر باشترین مامۆستای ناو ژیانم بەڕێکەوت پیشەی مامۆستایی هەڵبژارد.

مامۆستا ئەوەندە کاریگەرە، بۆ خۆشی نازانێت کاریگەرییەکەی کەی و لەکوێدا تەواو دەبێت.

هێنری ئادەمس

## سێشەممەی چوارەم

## باسی مردن دەکەین

مۆریی گوتی: با بە ئەمە دەست پێبکەین: هەموو کەسێک دەزانێ دەمرێ، بەڵام کەس باوەڕ بەو قسەیە ناکات.

ئەو سێشەممەیە مۆریی زۆر جددی بوو، بابەتی گفتوگۆکەشمان «مردن» بوو، یەکەم شت لەلیستەکەمدا. پێش ئەوەی بگەمە ماڵیان، مۆریی هەندێ شتی لەسەر پارچە کاغەزێک نووسیبوو بۆئەوەی بیری نەچنەوە و دواتر باسیان بکات. ئەو کاتە نەخۆشییەکە وای لەدەستوخەتی کردبوو، کە جگە لەخۆی کەسیتر بۆی نەدەخوێندرایەوە. خەریکبوو نزیک دەبووینەوە لە ڕۆژی جیهانیی کرێکاران. لەپەنجەرەی ژوورەکەی مۆرییەوە چاوم لە درەختەکانی ناو حەوشەی دواوەی خانووەکە بوو، گوێشم لەدەنگی ئەو منداڵانە بوو، کە لەدەرەوە یارییان دەکرد. هەفتەیەکیتر قوتابخانە دەستی پێدەکردەوە و ئیتر ئەو ئازادییەیان نەدەما.

لە (دیترۆیت)یش بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵیی و مامەڵەی خراپی دەزگای ڕاگەیاندنەکە هەموو مانگرتووەکان دەنگی خۆیان خستبووە پاڵ یەک و بەنیازی خۆپیشاندانێکی گەورە بوون دژی خاوەنکارەکانیان. کاتێک بەئاسمانەوە بووم بۆ لای مۆریی، لەفڕۆکەکەدا هەواڵێکم خوێندەوە لەسەر ژنێک، کە مێردەکەی و دوو کچەکەی

خ ەی لەخەودا کوشتبوو، ئەمە گوایە ویستوویەتی بیانپارێزێت ل «خەڵکی خراپ». لە (کالیفۆرنیا)ش پارێزەرەکانی ناو دادگاییەکەی ئ ەی سیمپسۆن تەواو بەناوبانگ ببوون.

لیرەش لەژوورەکەی مۆرییدا ڕۆژە بەنرخەکان یەک لەدوای یەک بەدەپەڕین. پێکەوە دانیشتبووین و تازەترین ئامێری ماڵەکەش، کە ئامێرێکی ئۆکسجین پێدان بوو، لەتەنیشتمانەوە بوو. ئامێرەکە بچووک بوو، بەرزییەکەی تا ئەژنۆ دەهات، ئاسانیش دەگوێزرایەوە. مۆریی لەو شەوانەدا، کە نەیدەتوانی هەوای تەواو هەڵمژێت، بۆرییە پلاستیکییە دەمکراوەکەی دەخستەسەر لوتی و هەوای هەڵدەمژی. من حەزم نەدەکرد هیچ ئامێرێک بە مۆرییەوە ببینم لەبەرئەوە کاتێک قسەی دەکرد هەوڵمدەدا چاوم نەخەمە سەر ئامێرەکە.

دووبارە گوتییەوە: هەموو کەسێک دەزانێ دەمرێ، بەڵام کەس باوەڕ بەو قسەیە ناکات. ئاخر ئەگەر باوەڕمان پێبکردایە، شتەکانمان بەشێوەیەکیتر ئەنجامدەدا.

منیش گوتم: کەواتە ئێمە لەبابەتی مردندا خۆمان هە ڵد ە خە ڵە تێنین ؟

– بەڵێ وایە، بەڵام چارەسەری هەیە، ئەویش ئەوەیە بەڕاستی باوەڕ بەوەبکەی کە دەمری و خۆتی بۆ ئامادە بکەی. بەوشێوەیە دەتوانی ژیانێکی باشتر و بەرهەمدارتر بژی.

بەس مۆریی، مرۆڤ چۆن بتوانێ خۆی ئامادە بکات بۆ مردن؟

ئەوە بکە، کە بودابییەکان دەیکەن. هەموو ڕۆژێک کە لەخەو هەستای، وایدابنێ چۆلەکەیەکی بچووک لەسەر شانتە و لێت دەپرسێت: بڵێی ئەمڕۆ ڕۆژەکە نەبێ؟ ئەی باشە ئامادەی بۆ ڕۆیشتن؟ ئایا خەریکی کردنی ئەوەیت، کە دەبێ بیکەی؟ ئایا لەهەوڵدای بۆ ئەوەی ببی بەو کەسەی دەتەوێ ببی؟

سەیرێکی سەرشانی خۆی کرد وەک ئەوەی چۆلەکەکەی ئیبینێت.
ئینجا گوتی: چۆلەکە گیان ئەمڕۆ ڕۆژەکەیە، یان نا؟
مۆریی زۆر بەئازادانە لەهەموو ئایینەکانەوە وتە و ئامۆژگاری وەردەگرت دەیخستنە ناو قسەکانییەوە. خۆی بە جوولەکەیی لەدایکببوو، بەڵام لەهەرزەکاریدا بەرامبەر هەموو ئایین و ئایدیۆلۆژییەکان گوماناویی بوو. هۆکاری سەرەکیش ئەو ڕووداوانە بوون، کە لەمندێید بەسەری هاتبوون. هەندێک لە وانە و فەلسەفەکانی ئایینی بوودی و مەسیحیی بەدڵبوو، وەک کولتووریش. زیاتر کولتووری جوولەکەی لەلا پەسەند بوو. مۆریی لەسەر ئایینەکان زۆری نەدەزانی ئەوە وایدەکرد زۆر کراوانەتر لەگەڵ خوێندکارەکانی دواتریدا لەسەر ئایینەکان بدوێت و پرسیار بکات. لەگەڵ ئەمانەشدا ئەو شتانەی لەچەند مانگی کۆتایی تەمەنیدا گوتنی بەشێوەیەک گرنگ و پڕمانا بوون، کە زۆرینەی ئاینەکانیان تێپەڕاند. ئەها مردن چی لە مرۆڤ دەکات!
مۆریی گوتی: میچ، ڕاستییەکە ئەوەیە کاتێک فێر دەبی چۆن بمری، فێریش دەبی چۆن بژی.
سەرم بۆ لەقاند.
دووبارەی دەکەمەوە: کاتێک فێر دەبی چۆن بمری. فێریش دەبی چۆن بژی.
زەردەخەنەیەکی کرد. تێگەیشتم مەبەستی لەو دووبارە کردنەوەیە چی بوو. دەیویست دڵنیابێت لەوەی لەو خاڵە تێدەگەم بەبێ ئەوەی پێویست بکات بەشەرمەوە پرسیار بکەم و دڵوای ڕوونکردنەوەی لێبکەم: ئەمە یەکێک بوو لەوشتانەی مۆریی کردبوو بەو مامۆستا باشە.
لێم پرسی: پێش ئەوەی نەخۆش بکەوی زۆرت بیر لەمردن

دەکـردەوە؟

بەزەردەخەنـەوە وەڵامـی دامـەوە: نـا، منیش وەک هەموو کەسێکیتر، تەنانـەت جارێکیـان لەوپـەڕی خۆشیدا بەهاوڕێیەکـی خۆمـم گـوت: من ساغترین پیـری دونیـام لێدەردەچـێ.

- ئەو کاتە تەمەنت چەند بوو؟

- شەست و شتێک بووم

- کەواتە گەشبین بووی

- بۆ گەشبین نەبم؟ وەک پێمگوتی، کەس بڕوا ناکات کە دەمرێ!

لێم پرسی: هەمووموان کەسێک هەیـە ناسیبێتمان و مردبـێ، ئـەی باشـە بـۆ ئەوەنـدە قورسـە بەلامانـەوە بیـر لـە مـردن و ڕاستی ڕوودانـی بکەینەوە؟

مۆریـی وەڵامـی دامـەوە: لەبەرئـەوەی زۆربەمـان لەژیانـدا وەک خەواڵـوو دێـن و دەچیـن. لەبەرئـەوەش، کـە خەواڵوویـن، ناتوانیـن بەتەواوەتـی ئەزموونـی ژیـان و زیندوویێتیـی بکەیـن. هەمیشـە خەریکـی ئـەو شـتانەین، کـە پێمانوایـە ئەگـەر نەیانکەیـن ژیانمـان تـەواو دەبـێ.

- باشـە، کەواتـە ڕووبەڕووبوونـەوە لەگـەڵ مـردن هەمـوو ئـەو شتانە دەگۆڕێ؟

- بەڵـێ بێگومـان، کاتێـک لـە مـردن نزیـک دەبیـەوە خـۆت لەهەمـوو شـتە لاوەکیـەکان دادەبـڕی و تـەواوی گرنگییـت دەدەی بـەو شـتانەی بەڕاستی گـەورە و گرنگـن. کاتێـک بـاوەڕ بـەوە دەکـەی کـە بەڕاستی دەمـری، شـتەکان زۆر جیاوازتـر دەبینـی.

ئاهێکـی هەڵکێشـا و بەردەوامبـوو: کـە فێـری مـردن بـووی، فێریش دەبـی چـۆن بـژی.

هەستمکرد ئێستا کـە دەجووڵا دەستەکانی دەلەرزین. عەینەکەکەی لەمـل کردبـوو، چەنـد جارێـک ویسـتی لەچـاوی بـکات و نەیتوانـی.

هەر لێی دەکەوتەوە خوارەوە، دەتگوت لەشەودەنگێکدا دەیکاتە چاوی کەسێکیتر. خۆم درێژکرد و عەینەکەکەیم بۆ خستە سەر گوێیەکانی. بەچرپە سوپاسێکی کردم. کاتێکیش دەستم بەر سەری کەوت زەردەخەیەکی کرد. بۆ مۆریی بچووکترین بەریەککەوتن لەگەڵ مرۆڤدا خۆشییەکی ئێجگار زۆری دەبەخشی.

- میچ، شتێک هەیە دەتوانم پێتبڵێم؟
- بەدڵنیاییەوە.
- ئاخر لەوانەیە پێتناخۆش بێ.
- بۆچی پێمناخۆش دەبێ؟
- باشە، دەیڵێم. میچ، بەڕاستی من پێموایە ئەگەر تۆ بەڕاستی گوێ لەو چۆلەکەیەی سەرشانت بگری و باوەڕ بەوە بهێنی، کە دەکرێ لەهەر ساتێکدا بمری، ڕەنگە ئەوەندە بەهەڵپە نەبی بۆ ژیان.

بەزۆر زەردەخەنەیەکم خستەسەر دەموچاوم.

- میچ گیان، ئەوشتانەی کاتیان زۆر پێوە بەسەردەبەی و ئەو هەموو کارانەی دەیانکەی، دەشێ ئەوەندەش گرنگ نەبن، کە تۆ لێیان تێگەیشتووی. ڕەنگە پێویست بێ بۆشاییەک بکەیتەوە بۆ هەندێ شتی ڕۆحییش، وانییە؟
- شتی ڕۆحیی؟
- ڕقت لەو وشەیەیە، وانییە؟ پێتوایە ئەمیش سەربە گروپی (سۆز و گریان)ە؟
- بەڵێ

هەوڵیدا چاوم لێدابگرێت، بەڵام هەوڵەکەی سەرینەگرت و کەوتمە پێکەنین. ئەویش بەپێکەنینەوە دەستیکردەوە بە قسە: میچ، تەنانەت خۆشم بەتەواوی نازانم «گەشەی ڕۆحیی» مانای چییە،

بەلام دڵنیام ئێمە شتێکمان کەمە. ئێمە لەشتە مادییەکانی ژیانماندا زۆر پڕچووین، ئەو شتە ماددیانەش ئاسوودەیی ڕاستەقینەمان پێنابەخشن. ئێمە لەبەهای ئەو پەیوەندییانەی هەمانن، ئەو گەردوونەی لە چواردەورمانە، هەموو شتێک، لەبەهای هەموو شتەکانمان کەمکردۆتەوە.

بەدەم سەیرکردنی پەنجەرەکەوە، کە تیشەکەکانی خۆر پیایدا هاتبوونە ژوورەوە، مۆریی سەرنجێکی بۆ لەقاندم و گوتی: ئەوێ دەبینی؟ تۆ هەرکاتێک بتەوێ دەتوانی بڕۆیتە دەرەوە، دەتوانی بەگەڕەکەکەدا ڕابکەی و خۆت شێت بکەی، بەلام من ئەوەم بۆ ناکرێ، ناتوانم ڕابکەم، ناتوانم بڕۆمە دەرەوە و ترسی نەخۆش کەوتنم نەبێ، بەلام دەزانی چی؟ من لەهەمووتان زیاتر سوپاسگوزارم بۆ ئەوەی کە ئەو پەنجەرەیە هەیە.

- سوپاسگوزاریت بۆ پەنجەرە؟!

- بەڵێ، هەموو ڕۆژێک لەوپەنجەرەیەوە سەیری دەرەوە دەکەم. ئەو گۆڕانکارییانە دەبینم کەبەسەر درەختەکاندا دێن، بەوەشدا بۆم دەردەکەوێ (با)کە چەند بەهێز بووە. وەک ئەوە وایە من کات ببینم بەبەردەمی پەنجەرەکەمدا بڕوا. من لەبەرئەوەی دەزانم ئەوەندەم نەماوە لێرە، زۆر خووم گرتووە بەسروشتەوە وەک ئەوەی یەکەمجار بێ بینیبێتم.

بۆماوەیەک وەستا و هەردووکمان لەپەنجەرەکەوە لەدەرەوەمان ڕوانی. منیش سەیری دەرەوەمکرد و هەوڵمدا ئەوە ببینم، کە ئەو دەیبینی، هەوڵمدا کات و وەرزەکان ببینم، ژیانی خۆم ببینم کە چۆن دێت و دەڕوات. مۆریی بەهێواشی سەری نزمکردەوە و سەیرێکی سەر شانی کردەوە، ئینجا بەدەنگێکی نزم گوتی: چۆلەکە بچکۆلەکە، ئەمڕۆیە؟ پێمبڵێ ئەمڕۆیە یان نا؟



بەهۆی دەرکەوتنییەوە لە بەرنامەی (نایت لاین)دا لەسەرانسەری دونیاوە نامە بۆ مۆریی دەهات. ئەگەر کەیفی هەبوایە، هاوڕێکانی و ئەندامانی خێزانەکەی کۆدەکردەوە و داوای لێدەکردن وەڵامی هەندێک لە نامەکانی بۆ بنووسنەوە. یەکشەممەیەک کاتێک ڕۆبن و (جۆن)ی کوڕی لەماڵەوە بوون، مۆریی هەموو ئەندامانی خێزانەکەی لە ژووری میوانەکە کۆکردەوە.

مۆریی لەسەر عەرەبانەکەی بوو، قاچە لاوازەکانیشی لەژێر بەتانییەکەوە بوون. ئەگەر سەرمای بوایە، پارمەتیدەرەکانی چاکەتێکیان دەدا بەسەر شانیدا. دەستی بەقسە کرد: ئادەی بزانین نامەی یەکەم دەڵێ چی؟

یەکێک لە هاوڕێکانی نامەیەکی خوێندەوە، کە لەژنێکەوە هاتبوو بەناوی نانسی. دایکی نانسی بەنەخۆشی ئەی ئێل ئێس کۆچی دوایی کردبوو. لەنامەکەدا نانسی ئەوەی نووسیبوو، کە دایکی زۆر ئازاری چەشتووە بەدەست نەخۆشیەکەیەوە و دەزانێ ئێستا (مۆریی)ش هەمان ئەو ئازارە زۆرە دەچێژێ.

کاتێک هاوڕێکەی لەخوێندنەوەی نامەکە بۆوە، مۆریی هەردوو چاوی داخست و گوتی: زۆرباشە، با وەڵامەکەمان لەمەوە دەست پێبکەین: نانسی ئازیز، چیرۆکی دایکتان زۆر کاری تێکردم. دەزانم بە چ ناخۆشییەکدا تێپەڕیوون. هەردوولاتان هەستتان بە ئازار و دڵتەنگییەکی زۆر کردووە. من بۆخۆم سوودم لەخەفەتخواردن بینیوە، هیوادارم ئێوەش سوودتان لێبینیبێ.

ڕۆب گوتی: ڕەنگە باشتر بێ دەستکارییەکی ئەو دێڕەی کۆتایی بکەی.

پاش ساتێک لەبیرکردنەوە مۆریی گوتی: ڕاست دەکەی پێت چۆنە بڵێین «هیوادارم لە خەفەتخواردندا هێزی چارەسەر بدۆزنەوە؟» ئەوە باشترە، وانییە؟

ڕۆب سەرێکی لەقاند.

- لەکۆتاییشدا بنووسە: سوپاستان دەکەم/ مۆریی.

نامەیەکیتر خوێندرایەوە، کە لەلایەن ژنێکەوە نێردرابوو بەناوی جەین. لەنامەکەدا جەین زۆر سوپاسی مۆریی کردبوو بۆ ئەو چاوپێکەوتنەی لەگەڵ بەرنامەی (نایت لاین) کردبووی. لەدێڕێکیشدا مۆریی بە «پەیامبەر» ناو بردبوو.

یەکێک لەوانەی لەژوورەکەدا بوون بەسەرسوڕماوییەوە گوتی: «پەیامبەر!» ئەوە ستایشێکی زۆر زۆرە.

مۆریی ڕووی گرژکرد. دیاربوو ئەو هەڵسەنگاندنەی (جەین)ی پێخۆش نەبوو. گوتی: با سوپاسی بکەین بۆ ئەو ستایشە زۆرەی و بۆشی بنووسە، کە مۆریی دڵخۆش بووە بە وشەکانی و سودی لێبینیون. بیریشت نەچێ لەکۆتاییدا بنووسی: سوپاستان دەکەم/ مۆریی.

نامەیەکیتر لەپیاوێکی بەریتانییەوە هاتبوو، کە داوای لەمۆریی دەکرد ڕێنمایی بکات چۆن بتوانێت لەڕێگەی جیهانێکی ڕۆحییەوە پەیوەندی بە دایکە کۆچکردووەکەیەوە بکات. نامەیەکیتر لە دوو خۆشەویستەوە هاتبوو، کە ویستبوویان بەسەیارە بێن بۆ بۆستن بۆ لای مۆریی. نامەیەکیتر، کە لەوانیتر درێژتر بوو، لەلایەن دەرچوویەکی زانکۆوە نێردرابوو کەباسی ژیانی خۆی دوای دەرچوون لەزانکۆ کردبوو. نامەکە باسی حاڵەتێکی کوشتن و حاڵەتێکی خۆکوشتن و سێ حاڵەتی لەدایکبوون بەمردوویی تێدابوو. کچەکە چیرۆکی دایکی گێڕابۆوە، کە چۆن بەنەخۆشی ئەی ئێل ئێس کۆچی کردووە.

نوسیبووی کە لەوە دەترسێت ئەویش توشی هەمان ئەخۆشی ببێت. نامەکە درێژەی کێشا، دوو پەڕە، سێ پەڕە، چوار پەڕە. (مۆریی) ش لەگەڵ چیرۆکەکانی ناویدا دەڕۆی. دواجار کە نامەکە تەواو بوو، زۆر بەلەسەرخۆیی گوتی: زۆرباشە، ئێستا بابزانین چی وەلامی ئەم کچە بدەینەوە؟

ئەوانەی لەژوورەکەدا بوون هەموو بێدەنگبوون. لەپڕ ڕۆب گوتی: دەڵێی چی هەر بۆی بنووسین «سوپاس بۆ نامە درێژەکەت» و تەواو؟

هەموو دەستیانکرد بە پێکەنین. مۆریی سەیرێکی (ڕۆب)ی کوڕی کرد و زەردەخەنەیەکی قووڵی کرد.

***

لەنزیک کورسییەکەی مۆرییەوە ڕۆژنامەیەک دانراوە، کە لاپەڕەی یەکەمی وێنەی یاریزانێکی بەیسبۆلی ویلایەتی (بۆستن)ی لەسەرە. لەدڵی خۆمدا دەڵێم لەناو ئەو هەموو نەخۆشییانەدا مۆریی توشی نەخۆشییەک بووە، کە بەناوی یاریزانێکەوە ناونراوە.

لێی دەپرسم: (لو گێرگ)ت لەبیرە؟

ـ لەبیرمە کە کۆتا یاری خۆی ئەنجامدا و دواتر لەیاریگاکەداماڵئاوایی لەهاندەرانی کرد.

ـ کەواتە دێڕە بەناوبانگەکەیت لەبیرە؟

ـ کامەیان؟

ـ بۆخاتری خوا! گروپی (یانکیس)، دێڕە بەناوبانگەکەی (لو گێرگ)! ئەوەی لەسەر هەموو موکەبەرەکان دەنگی دەدایەوە!

ـ نازانم، بیرم بخەرەوە. قسەکەم بۆ بکە.

لەپەنجەرە کراوەکەوە گوێم لەدەنگی سەیارەی خۆڵەکە دەبێت. هەرچەندە دونیا گەرمە، مۆریی کراسێکی قوڵ درێژی لەبەردایە و بەتانییەکیشی داوە بەقاچەکانیدا. وادیارە نەخۆشیەکە بەتەواوی بەسەریدا زاڵبووە. سەرم بەرزدەکەمەوە و قسەکەی (لو گێرگ)ی بۆ دەکەم. هەوڵدەدەم وشەکان بەوشێوەیە دەربڕم، کە لە موکەبەرەکانەوە دەگەیشتنە هاندەران: هەستدەکەم ئەمڕۆۆۆ... منننن بەبەختترینننن... پیاوییی ... سەر ئەم هەسارەیەمممم!

مۆریس چاوەکانی دادەخا و دوای سەر لەقاندنێک دەڵێ: وایە ڕاست دەکەی، بەڵام من واناڵێم.

## سێشەممەی پێنجەم

# باسی خێزان دەکەین

یەکەم سێشەممەی مانگی ئەیلول بوو. لەو هەفتەیەدا دەوامی زانکۆ دەستیپێدەکردەوە . دوای سی و پێنج پایزی یەک لەدوای یەک ئەمە یەکەمجار بوو زانکۆ دەست پێبکاتەوە و مامۆستا کۆنەکەم کۆرسێک وەرنەگرێت بۆ گوتنەوە. بۆستن پڕبوو لە خوێندکار و لەسەر شەقامەکان خەریکی داگرتنی کەلوپەلەکانیان بوون. لەم بەشەی شارەکەشدا مۆریی لەژوورەکەی خۆیدا دانیشتبوو. وەک ئەو یاریزانانەی تۆپی پێ دەهاتە بەرچاوم، کە واز لەیاریکردن دەهێنن و کاتێکیش بۆیەکەمجار لەماڵەوە بەتەلەفیزیۆن سەیری یاری تیپەکەی خۆیان دەکەن، دەڵێن: دەمتوانی ئێستاش لەگەڵیان بەردەوام بم.

من لەمامەڵەکردن لەگەڵ ئەو یاریزانانەوە فێر ببووم باشترین شت لەگەڵ ئەو کەسانەدا بیکەیت ئەوەیە کاتێک بەرەو کۆتایی دەڕۆن وازیان لێبهێنیت و لەسەر ئەو بابەتە نەیاندوێنیت، بەڵام مۆریی پێویستی بەوە نەبوو یەکێک بیری بهێنێتەوە، کە بەرەو کۆتایی دەڕوات، ئەو خۆی هەموو کات ئەوەی لەبیر بوو.

بۆ تۆمارکردنی گفتوگۆکانمان چیتر مایکرۆفۆنی دەستییمان بەکارنەدەهێنا، چونکە مۆریی نەیدەتوانی مایکرۆفۆنەکە بۆ ئەو ماوە زۆر بەدەستەوە بگرێت. لەجیاتی ئەوە ئەو مایکرۆفۆنە بچووکانەمان

پەیداکرد، کە دەکران بە ئێخەوە. بەدڵنیاییەوە لەبەرئەوەی مۆریی تەنیا کراسی نەرمی لۆکەی لەبەردەکرد و هەمووشیان گەورەبوون بەبەری، زۆر زوو مایکرۆفۆنەکە دەجولا و بەردەبۆوە بۆیە دەبوو منیش خۆم درێژ بکەم و لە شوێنی خۆی جێگیری بکەمەوە. وادیاربوو مۆریی ئەمەی پێخۆش بوو، چونکە بەهۆی ئەوەوە زوو زوو لێی نزیک دەبوومەوە وەک ئەوەی بمەوێت باوەشی پێدا بکەم، بەتایبەتیش لەئێستادا، کە حەزی مۆریی بۆ بەریەککەوتنی جەستەیی لەگەڵ مرۆڤیتر ئێجگار زۆر ببوو. کاتێک خۆم نوشتاندەوە دووبارە مایکرۆفۆنەکە جێگیر بکەم، گوێم لە خیزەی هەناسەی بوو.

بەنەرمی لێوەکانی خستە سەریەک و تفێکی قوتدا، ئینجا پێیگوتم: ئێ هاورێ گیان، ئەمرۆ باسی چی بکەین؟

- چۆنە باسی خێزان بکەین؟

- خێزان!

وشەکەی دووبارە کردەوە و کەمێک وەستا، ئینجا گوتی: خێزانەکەی من ئەمانەن، کە دەیانبینی.

بەسەر لەقاندنێک وێنەی سەر رەفەکانی نیشاندام: وێنەی خۆی بەمنداڵی لەگەڵ نەنکی، وێنەی خۆی بەگەنجی لەگەڵ (دەیڤد)ی برای، وێنەی خۆی و (شارلۆت)ی هاوسەری، وێنەی خۆی و دوو کورەکەی کە یەکێکیان رۆژنامەنووس بوو لە (تۆکیۆ)و ئەویتریشیان شارەزای بواری کۆمپیوتەر بوو لە بۆستن.

مۆریی گوتی: لەژێر رۆشنایی هەموو ئەو شتانەی ئەم چەند هەفتەیەی پێشوو باسمانکردوون، ئێستا خێزان وەک شتێکی زۆر گرنگتر لەجاران دەبینم. ئەگەر راستت دەوێ جگە لە خێزان هیچ بناغە و زەمینەیەکی پتەو نییە لەئەمرۆدا مرۆڤ لەسەری بوەستێ. ئێستا کە من نەخۆش کەوتووم بەئاشکرا ئەوەم بۆ دەرکەوتووە.

ئەگەر پشتگیرییکردن و خۆشەویستیی و گرنگیی پێدانی خێزانەکەت نەبێ، بەڕاستی هیچی وات نییە. خۆشەویستیی زۆر زۆر گرنگە. (ئۆدن)ی شاعیری بەناوبانگمان زۆر جوانی گوتووە، کە دەڵێ: یان یەکتریتان خۆش بوێ، یان بمرن.

قەڵەمەکەم هەڵگرت و نوسیمەوە: یان یەکتریتان خۆشبوێ، یان بمرن. گوتت قسەی (ئۆدن)ە؟

مۆرییش دووبارەی کردەوە: یان یەکتریتان خۆشبوێ یان بمرن. جوانە، وانییە؟ ڕاستیشە. میچ، بڕوا بکە ئێمە بەبێ خۆشەویستی وەک چۆلەکەی باڵشکاو واین.

بۆ ساتێک وەستا و دەستیپێکردەوە: وایدابنێ لە ژنەکەم جیاببومایەتەوە و ئێستا بەتەنیا بژیامایە، یان منداڵم نەبووایە، دەزانی ئەم نەخۆشییە چەندە قورستتر دەبوو لەسەرم! بەڕاستی دڵنیا نیم بەرگەیم دەگرت، یان نا! بێگومان خەڵک دەهاتن و سەردانیاندەکردم، هاوڕێ و هاوپیشەکانم دەهاتن، بەڵام هیچ کام لەو کەسانە وەک بوونی ئەو کەسە نییە کە دەزانی ناڕوا، کەسێک کە دەزانی گرنگیی تەواو بەداواکارییەکانت دەدا و بەردەوام چاوی لەسەرت دەبێ.

خێزان ئەمەشە، نەک هەر تەنیا خۆشەویستیی. خێزان ئەوەیە کە بەرامبەرەکەت دڵنیادەکەی لەوەی کەسێک هەیە ئاگای لێیەتی. من کاتێک دایکم مرد ئەمەم لەدەستدا. ئەوەی کە خێزانەکەت بەدەورتەوەن و چاویان لێتە لای من ناوی «پارێزراوی ڕۆحیی» ە. جگە لە خێزان هیچ شتێکیتر ئەو هەستیی پارێزراوییە لەناختدا دروست ناکات. نە پارە، نە ناوبانگ، نە هیچ.

ئینجا سەیرێکی منی کرد: نە کارەکەت!

پێکەوەنانی خێزان و بەڕێوەبردنی یەکێک بوو لەوشتانەی لەلیستەکەمدا نوسیبووم تا لەگەڵ مۆریی باسیبکەم. هەندێ شت

هەبوون دەمویست پێش ئەوەی درەنگ ببێت ڕاستیان بکەمەوە لەژیانمدا. باسی ئەوەم بۆ مۆریی کرد، کە چۆن ئەوەی سەردەمی من کێشەیان لەگەڵ منداڵبوون و منداڵ بەخێوکردندا هەیە و پێیانوایە، کە بوونە خاوەنی منداڵ ئیتر بەرنامەیان لێتێکدەچێت. ئەوەشم پێگوت، کە لای زۆریەی ئەو نەوەیەی ئێمە دایکایەتی و باوکایەتی شتێکن، کە هەست دەکەین بەبێ ئەوەی ویستبێتمان بەسەرماندا سەپێندراون. ڕاستییەکەی هەر لەبەردەم مۆرییدا دانم بەوەدا نا کە خۆشم هەندێک لەوبیرکردنەوانەم هەبوون.

کە سەیری (مۆریی)م دەکرد، بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر لەجێی ئەو بوومایە و مردنم ئەوەندە نزیک بووایە و لەگەڵ ئەوەشدا ژنم و منداڵم نەبووایە، بەرگەی ئەو بارودۆخەم دەگرت؟

مۆریی هەردوو کوڕەکەی فێری خۆشەویستی و گرنگیپێدان کردبوو، ئەوانیش وەک باوکیان شەرمیان لەدەربڕینی هەستەکانیان نەدەکرد. ئەگەر مۆریی بیوویستایە، کوڕەکانی ئامادەبوون واز لەهەموو ئیشەکانیان بهێنن بۆ ئەوەی هەموو ساتەکانی ژیانیان لەخزمەت باوکیاندا بن تا ئەوکاتەی بەجێیان دەهێڵێت، بەڵام مۆریی شتی وای نەدەویست. هەمیشە پێی دەگوتن: ڕۆڵە، لەبەر من ژیانی خۆتان مەوەستێنن، چونکە ئەگەر وابکەن مانای وایە ئەم نەخۆشییە زیانی لە سێیانمان داوە.

مۆریی تەنانەت لەو بارەشدا، کە بەرەو مردن هەنگاوی دەنا، ڕێزی لەژیان و دونیای منداڵەکانی دەگرت. کاتێک لەگەڵ کوڕەکانی لەتەنیشت یەکەوە دادەنیشتن، ڕووبارێک خۆشەویستی و شەیدایی لەنێوانیاندا دروست دەبوو. چەندین ماچی یەکتریان دەکرد و نوکتە و قسەی خۆشیان بۆیەکتر دەگێڕایەوە، بەدرێژایی ئەو ماوەیەش بەردەوام دەستیان لەناو دەستی یەکدەنا.

مۆریی سەیرێکی وێنەی کوڕە گەورەکەی کرد و گوتی: هەرکاتێک خەڵک پرسیارم لێدەکەن لەسەر منداڵ هەبوون، یان منداڵ نەبوون، هەرگیز پێیان ناڵێم چی بکەن و چی نەکەن، زۆر بەسادەیی دەڵێم: هیچ ئەزموونێکی ژیان وەک ئەزموونی هەبوونی منداڵ نییە! لەوە زیاتر ناڵێم. باوەڕم وایە هیچ شتێک جێگەی ئەو هەستە ناگرێتەوە. هەستی ئەوەی منداڵت هەیە شتێکە نە لەگەڵ خۆشەویست و نە لەگەڵ هاوڕێ و نە لەگەڵ کەسیتر بۆت دروست نابێ. ئەگەر دەتەوێ ببیتە خاوەنی بەرپرسیارییەتییەکی تەواو لەبەرامبەر مرۆڤێکیتردا و ئەزموونی خۆشەویستییەکی قووڵ بکەی، ئەوە دەبێ منداڵت هەبێ.

لێم پرسی: ئەگەر دووبارە بگەڕێیتەوە سەرەتا، دووبارە منداڵت دەبێتەوە؟

پرسیارەکەم کرد و سەیرێکی وێنەکەم کرد، کە تیایدا ڕۆب ماچێکی ناوچاوانی مۆریی کردووە و مۆرییش چاوی داخستووە و پێدەکەنێت. بەسەرسوڕمانییەوە پرسیارەکەی دووبارە کردمەوە: ئەگەر بگەڕامایەوە سەرەتا، دووبارە منداڵم دەبووە؟! هیچ، حەزدەکەم پێتبڵێم، ئەگەر ئەوە ڕووی بدایە، بەهیچ شێوەیەک ئامادە نەدەبووم لەبەرخاتری هیچ شتێک ئەو ئەزموونە لەدەست خۆم بدەم. تەنانەت ئەگەر....

تفێکی قوتدا و وێنەکەی خستەسەر باوەشی: هەرچەندە شتێکی تاڵ ناخۆشیش بەڕێوەیە.

- مەبەستت ئەوەیە، کە بەمزووانە بەجێیان دەهێڵی.
- بەڵێ، بەڵێ.

لێوەکانی خستەسەر یەک و هەردوو چاوی داخست. لەو ساتەدا بوو یەکەم فرمێسکم بینی بەسەر ڕوومەتیدا هاتەخوار.

بەچرپە پێیگوتم: دەی ئێستا تۆ قسەم بۆ بکە.

- من؟

- باسی خێزانەکەتم بۆ بکە. لەسەر دایک و باوکت شت دەزانم. چەند ساڵێک پێش ئێستا لە ڕۆژی دەرچوونەکەتدا بینیمن. خوشکێکیشت هەیە، وانییە؟

- ڕاستە

- لە تۆ گەورەترە؟

- بەڵێ.

- برایەکیشت هەیە؟

سەرم لەقاند.

- لەخۆت بچووکترە؟

- بەڵێ بچووکترە.

- منیش برایەکی لەخۆم بچووکترم هەیە.

- کەواتە وەک یەکین.

- ئەرێ براکەشت هاتبوو بۆ ئاهەنگی ڕۆژی دەرچوونەکەت؟

چاوێکم تروکاند و بۆ ساتێک هەموومانم لەهەمان ئەو شوێنەدا بینییەوە، کە ڕۆژی ئاهەنگەکە لێی وەستابووین. شانزە ساڵ لەوەوپێش، هەتاوە بەهێزەکە، ڕۆبە شینەکان، ئەوەی کە هەموو دەستمان خستبووە ناوقەدی یەکتر و وەستابووین وێنەمان دەگرت، ئەوەی کە کابرای وێنەگر دەیگوت، یەک، دوو، سێێێێ...

دوای ئەوەی تێبینی بێدەنگییەکەمی کرد، مۆریی لێی پرسیم: ئەوە چییە؟ بیر لەچی دەکەیتەوە؟

- هیچ، هیچ.

***

هەر بەڕاستی من برایەکم هەیە و دووساڵیش لە خۆم بچووکترە. کوڕێکی قژ زەردی چاو قاوەییە و هیچ لە من و خوشکە قژ ڕەشەکەم ناچێت. بیرمە کە منداڵ بووین لەگەڵ خوشکەکەم تووڕەمان دەکرد و پێمان دەگوت، کە ئەویان لەبەردەمی ماڵمان داناوە و باوک و دایکیشم دۆزیویانەتەوە. ئینجا بەوەش دەمانترساند، کە دەمانگوت: ڕۆژێک دێن و دەتبەنەوە بۆ خۆیان، ئەویش دەستیدەکرد بەگریان و هاوار، بەڵام ئێمە نە جارێک و نە دووان قسەکەمان دووبارە دەکردەوە.

منداڵی پاشەبەرە بەگشتی چۆن گەورەدەبن، براکەی منیش ئاوا گەورەبوو. لەگەڵ خوشکەکەم یاریمان لەگەڵدەکرد و زۆریشمان خۆشدەویست، بەڵام لەناخەوە ئازارمان دەدا. خەونی براکەم ئەوەبوو ببێتە ئەکتەر، یان گۆرانیبێژ. لەسەر نانی ئێوارە لاسایی ئەکتەری ناو دراما تەلەفیزیۆنییەکانی دەکردەوە و زۆر کات زەردەخەنەیەکی جوان لەسەر لێوەکانی بوو. من زیرەک بووم و ئەو تەمبەڵ، من گوێڕایەڵبووم و ئەو بێگوێ، من لە ماددەی بێهۆشکەر و خواردنەوە کحولییەکان نزیک نەکەوتمەوە و ئەو هەر شتێک گەدەی هەرسی بکردایە دەیخوارد و دەیخواردەوە. بەماوەیەکی کەم دوای ئەوەی خوێندنی ئامادەیی تەواوکرد، ڕۆیشت بۆ ئەورووپا لەبەرئەوەی ئەو ژیانە سادەیەی ئەوێی پێخۆشتر بوو. سەرەڕای ئەو هەموو شتانەش کەچی هێشتا لەناو خێزانەکەماندا هەر ئەو منداڵە خۆشەویستەکە بوو. کاتێک دەگەڕایەوە بۆ ئەمەریکا و پێکەوە دادەنیشتین، قسە خۆشەکانی و هەڵسوکەوتە شێتانەکانی وایان لەمن دەکرد هەست بکەم کەسێکی زۆر نەگۆڕ و تەقلیدیم.

لەبەرئەوەی ئەوەندە جیاواز بووین لەیەکتر، هەمیشە پێموابوو لەهەرزەکارییەوە هەریەکەمان ڕێگای خۆی دەگرێتەبەر و دوای ژیانی خۆی دەکەوێت. لەهەموو پێشبینییەکانمدا ڕاست بووم لەیەک دانەیاندا

نەبێت. لەو ڕۆژەوەی کە مێردی پوورم مرد، منیش ئەوە هاتە مێشکمەوە، کە مردنێکی لەوەی ئەو دەمرم، نەخۆشییەک دەگرم و تا مردن پێوەی دەناڵێم، هەر لەبەرئەوەش بوو زۆر بەخێرایی کارمدەکرد.

خۆم ئامادەکردبوو بۆ شێرپەنجە، هەستم بەهەناسەکانی نەخۆشییەکە دەکرد، کە لێم نزیک دەبێتەوە. دەمزانی هەر دەمگاتێ. وەک حوکمدراوێک چاوەڕێی جێبەجێکردنی سزای لەسێدارەدانەکەی بێت، ئاوا چاوەڕێی شێرپەنجە بووم.

ڕاستیشم کرد، شێرپەنجەکە هات،

بۆ براکەم.

بەڵام بۆ من نا،

هەمان ئەو شێرپەنجەیە بوو، کە تووشی مێردی پوورم بوو: شێرپەنجەی پەنکریاس. بەوشێوەیە بچووکترین منداڵی خێزانەکەمان چارەسەری کیمیایی بۆ کرا، قژە زەردەکەی هەڵوەری و چاوە قاوەییەکانی کوژانەوە، هێندە لاواز بوو دەموچاوی تەنیا ئێسەکەکەیان لێ مایەوە. من پێموابوو دەبوو ئەوە من بم تووشی نەخۆشیەکە ببوومایە.

بەڵام براکەم نە وەک من بوو نە وەک مێردی پوورم، بەڕاستی جەنگاوەرێک بوو بۆخۆی. لەمنداڵییەوە هەر وابوو، کاتێک لەژێرزەمینەکە زۆرانبازییمان دەکرد، هەموو جارێک، کە خەریکبوو بیخەم، لەسەر پێڵاوەکەمەوە گازی لە قاچم دەگرت و زریکەی لێهەڵدەستاندم، منیش بەپەلە بەرمدەدا.

براکەم لە ئیسپانیا گیرسایەوە، لەوێ بەیارمەتی دەرمانێک، کە نە ئەوکاتە و نە ئێستاش لە ئەمەریکا دەستناکەوێت، بەرەنگاری نەخۆشییەکەی بۆوە. هەموو ئەورووپای کرد بۆ چارەسەر، دوای پێنج ساڵ لە چارەسەر وەرگرتن، دەرمانەکە نەخۆشییەکەی ڕاونا.

بەڕاستی ئەوە هەواڵێکی زۆر خۆش بوو بۆ هەموومان، بەڵام هەواڵ ناخۆشەکە ئەوەبوو براکەم چیتر ئامادەنەبوو من ببینێت، لەڕاستیدا نەیدەویست نە من و نە هیچ ئەندامێکیتری خێزانەکەمان ببینێت. چەند تەلەفۆنمان بۆ کرد بۆ ئەوەی سەردانی بکەین، هیچ سوودی نەبوو. ئەو هەر سووربوو لەسەر ئەوەی بەتەنیا شەڕ لەگەڵ نەخۆشییەکەی بکات.

چەندین مانگ تێپەڕین و وشەیەکمان لێوە نەبیست. ئەو نامە دەنگییانەی لەسەر تەلەفۆنەکەی بۆمان بەجێدەهێشتن بەبێ وەڵام دەمانەوە. لەناخەوە تەواو هەستم بەتاوانباریی دەکرد لەوەی دەبوو زۆر شتی بۆ بکەم و نەمدەتوانی. لەلایەکی تریشەوە زۆر لێی پەست ببووم، کە کەللەڕەقی دەکرد و ڕێگەی نەدەدا ئێمە هیچ یارمەتییەکی بدەین.

دیسان خۆم هەڵدایەوە ناو دونیای کار. بۆیە کارم دەکرد، چونکە کار کۆنترۆڵ دەکرا و وەڵامیشی دەدایەوە. هەموو جارێکیش کە تەلەفۆنم بۆ براکەم دەکرد، تەلەفۆنەکە بە ئیسپانی و لەسەر دەنگی براکەم وەڵامی دەدایەوە و داوای دەکرد نامەیەکی دەنگی بەجێبهێڵم. بەوەدا بیرم دەکەوتەوە من و براکەم چەندە لەیەکتر دوورکەوتووینەتەوە. بەناچاری دامدەخستەوە و دەستمدەکردەوە بە کارکردن.

ڕەنگە مەسەلەی ئەم برایەشم یەکێکتر بێت لەو هۆکارانەی وایکرد ئەوەندە هۆگری مۆریی ببم. مۆریی دەرفەتی بە مندا بگەمە ئەو شوێنەی براکەم نەیتوانی پێی بگات. ئێستا کە بیر لەڕابردوو دەکەمەوە، دەڵێم ڕەنگە مۆریی پێشوەخت ئەم شتانەی هەموو زانیبێت!

***

وەرزی زستانە و منیش هێشتا منداڵم. بەفرێکی زۆر باری بوو و هەموومان چووین بۆ یەکێک لە گردەکانی نزیک ماڵی خۆمان. من و براکەم لەسەر خلیسکێنەی سەر بەفر دانیشتووین. من لەپێشەوەم و براکەم لەدواوە باوەشی پێدا کردووم. هەست بە چەناگەی دەکەم لەسەر شانم و قاچەکانیشی تا سەر ئەژنۆم ڕاکێشاوە. خل دەبینەوە و خلیسکێنەکە بەسەر دار و بەرددا دەڕوات. تا زیاتر دەڕۆینەوە خوارەوە خلیسکێنەکەمان خێراتر دەبێت. لەپڕ یەکێک هاوار دەکات: هێی! هێی! سەیارە هات!

دەبینین بەڕاستی سەیارەیەک لای چەپمانەوە خەریکە دێت. هاواردەکەین و هەوڵدەدەین خۆمان لادەین، بەڵام ناتوانین. کابرای شۆفێر دەست دەخاتە سەر هۆڕن و ئیستۆپێکی قایم دەگرێت، ئێمەش بەخێرایی خۆمان هەڵدەدەینە خوارەوە و دەمانەوێت ڕابکەین لەبەردەم سەیارەکەدا. بەخۆمان و قەمسەڵە کڵاودارەکەمانەوە بەناو سەرما و بەفرە تەڕەکەدا خل دەبینەوە و بیرمان لای ئەوەیە، کە ئێستانا ئێستا تایەی سەیارەکەمان دەگاتێ. دەترسین و پڕ بەدەنگی خۆمان هاوار دەکەین. زۆر دەترسین و لەگەڵ خل بوونەوەماندا خێرا خێرا دونیا لەبەرچاومان دەخولێتەوە.

خۆشبەختانە هیچ ڕوونادا. دەوەستین و هەناسەیەک هەڵدەکێشین ئینجا بەفری سەر دەموچاومان لادەدەین.

شوفێری سەیارەکە سەیرێکمان دەکات و بەشێوازی جوڵاندنی پەنجەیدا دەزانین تورەیە لێمان. ئێمە سەلامەتین. لەخوارترەوە خلیسکێنەکەمان دەیدا بە تۆپەڵێک بەفری گەورەدا و بەرزدەبێتەوە. هاوڕێکانمان بەخۆشییەوە پێماندا دەکێشن و دەڵێن: جوانە! باشبوو سەلامەت دەرچوون. خۆ خەریکبوو بتانکوژێ!

من و براکەم زەردەخەنەیەک بۆ یەکتری دەکەین، کە هێشتا خۆبەزلزانیی منداڵیی تێدا ماوە. لەدڵی خۆماندا دەڵێین: شتەکە ئەوەندەش ترسناک نەبوو. ئینجا دیسان دەستدەکەینەوە بەڕووبەڕووبوونەوەی مردن.

# سێشەممەی شەشەم
## باسی هەست و سۆز دەکەین

بەلای دارە گەلاسوورەکەدا ڕۆیشتم و قاچم خستەسەر یەکەم قادرمەی بەردەرگای ماڵی مۆریی. بارانـاوی سەربانەکە بە بۆرییەکدا دەهاتەخوارەوە بۆ بەردەرگا. لە زەنگمدا و ئەمجارەیان لەجیاتی کۆنیی، (شارلۆت)ی هاوسەری مۆریی هات دەرگای لێکردمەوە. شارلۆت ژنێکی جوانیی قژ ماشوبرنجی بوو، بەدەنگێکی خۆش و هێمن قسەی دەکرد. ئەوکاتانەی من دەچووم بۆ ئەوێ زۆر کەم ڕێدەکەوت لەماڵ بێت. تا ئەوکاتەش هەر لە زانکۆی (ماساچوستسی تەکنەلۆژیی) کاری دەکرد. بەلامەوە سەیر بوو ئەو بەیانییە لەماڵەوە بوو.

شارلۆت پێیگوتم: ئەمڕۆ مۆریی باش نییە.

ئینجا سەیرێکی کردم و پێشمکەوت بۆ مەتبەخەکە.

پێمگوت کە زۆر بەداخەوەم مۆریی باش نییە، بەلام ئەو بەخێرایی وەلامی دامەوە: نا، نا، وامەڵێ، تۆ ببینێ باش دەبێ. دڵنیام....

لەناوەڕاستی ڕستەکەدا وەستا. نیوە ئاوڕێکی دایەوە و گوێی بۆشتێک هەڵخست، پاش ساتێک دەستیکردەوە بە قسە: دڵنیام بزانێ تۆ هاتووی زۆری پێخۆش دەبێ و باشیش دەبێ.

ئەو عەلاگانەم بەرزکردەوە، کە لە بازاڕ پڕمکردبوون لە شت بۆ مۆریی.

بەپێکەنینەوە گوتم: دیسان خواردنە سادەکانمن.

شارلۆت بەزەردەخەنەیەک و کەمێک نیگەرانییەوە بەلاکەکانی لێوەرگرتم: ئێستاش خواردنی جاری پێشوو ماوە، لەوکاتەوە مۆریی هیچی وای نەخواردووە!

بەو قسەیەی شارلۆت تەواو سەرم سوڕما. لێم پرسی: هەر بەڕاست هیچی لەشتەکان نەخواردووە؟

شارلۆت سەلاجەکەی کردەوە و بینیم پڕە لە زەلاتەی مریشک، چەندین جۆر سەوزە و میوە، خواردنی قوتو، هەروەها هەموو لەو شتانەی لە سەردانەکانی پێشوومدا بۆم کڕیبوو. فرێزەکەی کردەوە و ئەویش پڕبوو.

- مۆریی ناتوانێ زۆربەی ئەم خواردنانە بخوا. بۆی قوت نادرێن. دەبێ خواردنی سوک و شلەمەنی بخوا.

بەسەرسوڕماوییەوە گوتم: بەڵام شتی وای لای من باس نەکردووە تا ئێستا!

- لەبەر ئەوەی نەیویستووە بێتاقەتت بکات.

- نا، نا، ئاساییە. من تەنها مەبەستم بوو بەشێوەیەک لەشێوەکان یارمەتییەکی بدەم. نەمویست بەدەستی بەتاڵ بێم بۆلای.

- هاتنی خۆت زۆر زۆرە. مۆریی زۆر بەتامەزرۆییەوە چاوەڕێی سەردانەکانی تۆ دەکات. پرۆژەیەکی هەیە دەیەوێ لەگەڵ تۆ ئەنجامیبدا، بۆیە کات دەدۆزێتەوە بۆ دانیشتن لەگەڵ تۆ و باشی مێشکی دەخاتەکار. وابزانم ئەم پرۆژەیەی لەمێشکیدایە وایلێدەکات هەست بکات مەبەستێک لەهەموو ئەم شتانەدا هەیە.

شارلۆت دووبارە گوێی هەڵخستەوە و بۆ شتێک، کە نەمزانی چییە. دەمزانی شەوەکانی مۆریی بەرەو قورستر دەڕۆن. دەمزانی ئیتر شەوان خەوی لێناکەوێت، ئەوەش مانای ئەوەبوو (شارلۆت)

یش خەوی لێناکەوێت. هەندێکجار مۆریی هەڵدەستا و بەسەعات دەکۆکی و ماوەیەکی زۆری دەویست تا قورگی پاک دەبۆوە.
ئێستا ئەو کەسانەی چاودێری تەندروستی مۆرییان دەکرد بە شەو دەمانەوە و ئەو میوانە زۆرانەی بەرۆژیش دەهاتن، وەک خوێندکارە کۆنەکانی، مامۆستایانی هاورێی، مامۆستا رۆحییەکان، هەندێکجار ژمارەیان دەگەیشتە یەک دەرزەن و زۆرجار تا ئەو کاتەی شارلۆت دەگەیشتەوە ماڵەوە نەدەرۆیشتن. شارلۆت زۆر بەئارامگرییەوە مامەڵەی لەگەڵ دۆخەکەدا دەکرد. هەرچەندە زۆربەی میوانەکان (شارلۆت)یان لەنزیکەوە نەدەناسی، بەڵام ئەو ساتە بەنرخانەیان لێ دەگرت، کە دەبوو لەگەڵ مۆریی بەسەریان بەرێت.
شارلۆت بەردەوامبوو لەقسەکانی: ئا! مۆریی هەست دەکات مەبەستێک لەهەموو ئەم شتانەدا هەیە، ئەوەش شتێکی باشە.
منیش گوتم: هیوادارم وابێ.
لەگەڵ شارلۆت خواردنە تازەکانمان خستەناو سەلاجەکەوە. کەوانتەرەکە چەندین پارچە کاغەزی بچووکی پێوە بوو، زانیاری، پەیامی خەڵک بۆ مۆریی و کات و چۆنیەتی بەکارهێنانی هەندێک لەدەرمانەکان. لەئێستادا لەهەموو کاتێک زیاتر قوتوو پاکەتی حەب لەسەر مێزەکە هەبوون، حەبی (سێلستەون) بۆ رەبۆکەی، (ئاتیڤان) بۆ خەو، (ناپرۆکسین) بۆ هەوکردن، هەروەها شیری وشک لەگەڵ حەبی ریخۆڵەش.
دەنگی دەرگا لەهۆڵەکەوە هات.
- رەنگە ئێستا کاتی هەبێ، با بچم سەیرێک بکەم.
شارلۆت جارێکیتر سەیری خواردنەکانی کردەوە و منیش لەجێی خۆمەوە هەستم بەشەرمەزاری کرد. ئەو خواردنانە شتێک بوون، کە ئیتر مۆریی جارێکیتر چێژی لێنەدەبینیەوە.

نەخۆشییەکەی مۆریی وردە وردە مەترسیدارتر دەبوو. کاتێک چرووزوورەکەی و لەگەڵی دانیشتم، زۆر خراپ دەکۆکی، کۆکەیەکی وشکی بەهێز، کە سنگی دەلەرزاند و سەری بەپێشەوەدا دەخست. دوای یەک کۆکەی بەهێز وەستا، هەردوو چاوی داخست و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. لەجێگەی خۆم بەبێدەنگی دانیشتبووم لەبەرئەوەی دەمزانی میلاکە و توانای هیچی نییە لەوکاتەدا.

هێشتا چاوەکانی نەکردبۆوە، کە پێیگوتم: تۆمارکەرەکەت هەڵکردووە؟

بەخێرایی دەستم نا بە دوگمەی تۆمارکردندا و گوتم: بەڵێ! بەڵێ!

هەربەچاوی داخراوەوە بەردەوامبوو: ئەوەی لە ئێستادا هەوڵدەدەم بیکەم ئەوەیە خۆم و بیرکردنەوەم لەنەخۆشییەکەم دابڕم.

- خۆتی لێدابڕی؟!

- بەڵێ، خۆمی لێدابڕم. ئەوە شتێکی زۆر گرنگە، نەک هەر تەنیا بۆ کەسێکی وەک من، کە سەری لەگوێی قەبر دەلەرزێ، بەڵکو بۆ تۆش گرنگە، کە تەندروستیت زۆر باشە. فێربە چۆن خۆت لەشتەکان دابڕی.

چاوی کردەوە و هەناسەیەکی دایەوە: دەزانی بوودایییەکان دەڵێن چی؟ دەڵێن: بەتوندی خۆت بەشتەکانەوە مەبەستەرەوە لەبەر ئەوەی هەموو شتێک کاتییە.

منیش لێمپرسی: ئەی تۆ هەموو جارێک ناڵێی دەبێ ژیان ئەزموون بکەین بە هەموو خۆشیی و ناخۆشەکانییەوە؟

- بەڵێ

- ئێ ئەوە چۆن دەکرێ ئەگەر خۆت لە شتەکان دابڕی؟

- زۆرباشە میچ! کەواتە بیر دەکەیتەوە. کە دەڵێم خۆت دابڕە لە شتەکان مەبەستم ئەوە نییە پێتبڵێم ئەزموونەکە تاقیمەکەرەوە.

بەپێچەوانەوە تۆ لەڕێگەی ئەزموونکردنی ئەو دۆخەوە دەگەیتە ئەو دابڕانەی باسی دەکەم. بەو شێوەیە دەتوانی دۆخە ناخۆشەکە بەجێبهێڵی و بەسەریدا سەرکەوی.

- تێناگەم

- باشە. هەر هەستێک بگری، هەستی خۆشەویستیی بۆ ژن، هەستی خەفەت خواردن بۆ مردنی کەسێک، یان ئەمەی ئێستا منی پێدا تێدەپەڕم، مەبەستم ترس و ئازارە لەنەخۆشییەکی کوشندە، ئەگەر ئەو هەستە لەخۆتدا سەرکوت بکەی و ڕێگە بەخۆت نەدەی تاقی بکەیتەوە، هەرگیز ناتوانی خۆتی لێدا ببڕی، چونکە ترسەکەت بایی ئەوەندە مێشکتی داگیرکردووە، کە ناهێڵێ ئەو کارە بکەی. لە ئازارەکە دەترسی، لە خەفەتەکە دەترسی، لەوە دەترسی کە خۆشەویستییەکەت بۆ ئەو شتە، یان کەسە دیاریکراوە لەدەست بچێ. بەڵام ئەگەر بەتەواوی خۆت بخەیتە ناو ئەو هەستەوە و هەمووی تاقیبکەیتەوە، ئیتر دەزانی ئازار چییە، دەزانی خەفەت چییە، دەزانی خۆشەویستیی چییە. تەنها ئەو کاتەش دەتوانی بگەیتە ئەوەی خۆت داببڕی لەو هەستە ناخۆشە. بۆ نموونە بەخۆت دەڵێت: تەواو! من ئەو شتەم ئەزموون کرد و ئێستا دەزانم چییە و چۆنە. دەیناسمەوە. دەی ئینجا ئێستا کاتی ئەوەیە ئەو هەستە لە خۆم داببڕم.

مۆریی وەستا و سەیرێکی کردم، ڕەنگە بۆ ئەوە بوو بێت بزانێ تێگەیشتووم. دواتر بەردەوامبوو لەقسەکانی: دەزانم ئێستا پێتوایە ئەمە تەنها پەیوەندی بە مردنەوە هەیە، بەڵام مەسەلەکە هەر ئەوەیە، کە پێشتر پێمگوتووی: ئەوکاتەی فێر دەبی بمری، فێریش دەبی چۆن بژی.

دواتر مۆریی باسی ئەو ساتانەی بۆ کردم، کە تیایاندا زۆر ترساوە. یەکێک لەوانە ئەو کاتە بووە، کە هەستیکردووە سنگی

قفڵ دراوە و زۆر بەقورسی هەناسەی بۆ دراوە، بەشێوەیەک دڵنیا نەبووە لەوەی هەناسەیەکیتری بۆ دەدرێ یا نا. ئەو جۆرە کاتانە بۆ مۆریی زۆر ترسناک بوون و یەکەمجار، کە بەسەریهاتوون زۆر ناخۆش و ترسێنەر بوون، پڕبوون لە دڵتەنگیی و شڵەژان. بەڵام دوای ئەوەی ئەو سات و هەستانەی تاقیکردۆتەوە و تامی ئازارەکانیانی کردووە، لەگەڵیاندا لەرزیوە و و ئارەقی پێیان کردۆتەوە، توانیویەتی بەخۆی بڵێت: زۆرباشە، تێگەیشتین. ئەمەی ئێستا هەستی پێدەکەی «ترس»ە. تەواو! لەکۆڵ خۆتی بکەرەوە و نەتەوێ.

بیرم دەکردەوە لەوەی کە ئەم شتە چەندە پێویستە لەژیانی رۆژانەماندا. بۆ نموونە زۆرجار ئێمە تاڕادەی گریان هەست بە تەنیایی دەکەین و رێگەش بە فرمێسکەکانمان نادەین بێنە خوارەوە، چونکە پێمانوایە نابێت بگرین. یان کاتێک هەست بەخۆشەویستییەکی زۆر دەکەین لەبەرامبەر خۆشەویست، یان هاوسەرەکەماندا و هیچ ناڵێین لەبەرئەوەی دەترسین لەوەی کە وشەکانمان دواتر زیان لەپەیوەندییەکەمان بدەن.

مۆریی بەتەواوەتی لەرێگەیەکی ترەوە بۆ بابەتەکە چووبوو: بەلوعەکەتان بکەنەوە و خۆتان بە هەستەکانتان بشۆن. مەترسن، ئازارتان ناگات، ئەوە تەنها یارمەتیتان دەدات. ئەگەر رێگە بدەی ترسەکە بچێتە ناوتەوە و وەک یەکێک لە کراسەکانت لەبەری بکەی، دوای ئەوە دەشتوانی بەخۆت بڵێی: زۆرباشە، ئەمە ترسە و تەواو، نابێ بهێڵم کۆنترۆڵم بکات. هەمووی ئەوەیە، کە دەیبینم و پێویست ناکات لەخۆمی گەورە بکەم.

بۆ هەستی (تەنیایی)ش هەمان شتە. فرمێسک دەرێژی، بەتەواوی هەست بە تەنیاییەکەت دەکەی، بەڵام لەکۆتاییدا دەتوانی بەخۆت بڵێی: زۆرباشە، ئێستا کاتی من لەگەڵ «هەستیی تەنیابوون» تەواو

بوو، ئیتر ناترسم لەتەنیاییەکەم و دەیخەمە لاوە. چەندین هەستی خۆش هەن، ئێستا با ئەوان تاقیبکەمەوە.

مۆریی جەختی لەسەر کردەوە: خۆت دابڕە لێیان.

ئینجا هەردووچاوی داخست و کۆکی،

دووبارە کۆکییەوە،

جارێکیتریش،

ئەمجارە بەدەنگێکی بەرزتر.

لەپڕ هەستمکرد خەریکە دەخنکێت، ئەو شلەیەی لەناو سییەکانیدا کۆببۆوە دیاریبوو گاڵتەی لەگەڵ دەکرد، سەردەکەوت و تانیوەی ڕێگا دەهات، دواتر دەچۆوە خوارەوە و هەناسەکانی لێدەدزی. مۆریی بەچاوی داخراوەوە کەوتە کۆکە و قرخە قرخ. دەستەکانی ڕادەوەشان. لەشوێنی خۆمەوە ناوچاوانم ئارەقی کردەوە. هەستام و دەستێکم کێشا بەبەشی پشتەوەی شانیدا، ئەویش دەستەسرێکی برد بۆ دەمی و بەڵغەمێکی تێ دەکرد.

دواجار کۆکەکە وەستا. سەری خستەوە سەر سەرینەکە و هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی.

هەوڵمدا ترسەکەم بشارمەوە، لەسەرخۆ گوتم: باشی مۆریی گیان؟

پەنجەیەکی بەرز کردەوە و بەدەنگێکی نزم وەڵامی دامەوە: بەڵێ، باشم. بەس پەلەم لێمەکە.

بەبێدەنگ و بەتەنیشت یەکەوە دانیشتین تا ئەوکاتەی هەناسەدانی گەڕایەوە باری ئاسایی. هەستمکرد تەپڵەسەرم ئارەقی کردۆتەوە. مۆریی داوای لێکردم پەنجەرەکە دابخەم. شنەبایەکی دەهات، بەڵام بۆ مۆریی سارد بوو. لەدەرەوە پلەی گەرمی بیست و شەش بوو.

لەکۆتاییدا بەچرپە پێیگوتم: ئێستا دەزانم دەمەوێ چۆن چۆنی بمرم.

هیچم نەگوت و چاوەڕێی قسەیترم کرد.

- دەمەوێ بەهێمنی بمرم، زۆر بەئارامی، نەک لەشێوەیەکی وەک ئەوەی ئێستادا. هەر لێرەشەوەیە خۆ دابڕین لەهەستەکان دروست دەبێ. ئەگەر لە کاتی کۆکەیەکی لەوشێوەیەدا بمرم، دەبێ بتوانم خۆم لەترسەکەی دابڕم. پێویستە لەو کاتەدا بەخۆم بڵێم: ئەمە ساتەکەیە. من نامەوێ بە ترسەوە ئەم دونیایە بەجێبهێڵم. ئەو کاتەی دەمرم دەمەوێ بزانم چی دەگوزەرێ، هەموو شتێک قبوڵ بکەم و ئینجا بڕۆم بۆ شوێنێکی خۆش و ئارام. تێدەگەی میچ؟

سەرێکم لەقاند.

ئینجا بەخێرایی گوتم: بەس تکایە جارێ مەڕۆ.

مۆریی بەزۆر زەردەخەنەیەکی کرد: نا، جارێ ناڕۆم. ئێشمان ماوە پێکەوە!



لێی دەپرسم: باوەڕت بەوە هەیە دوای مردن ڕۆحی مرۆڤ بچێتە ناو جەستەی مرۆڤێک، یان شتێکی ترەوە؟

ـ ڕێی تێدەچێ

ـ ئەگەر بەدەست خۆت بێ دەتەوێ ئەمجارە ڕۆحی تۆ بچێتە چییەوە؟

ـ ئەگەر بەدەست خۆم بێ، ئاسک.

ـ ئاسک!

ـ بەڵێ. ئاسک زۆر جوانە و زۆریش خێرایە.

ـ ئەوە بەڕاستە؟! هەر ئاسکی ئاسک؟!

مۆریی زەردەخەنەیەکی پێمدێ و دەڵێ: چییە؟ پێت سەیرە؟

سەیرێکی جەستە بچووکەکەی دەکەم: جلە گەورەکانی، گۆرەوییەکانی پێی، قاچەکانی کە لەسەر بەشێکی جێگاکەی دایناون و ناتوانێت بیانجولێنێت ــ وەک زیندانییەک دێتە بەرچاوم، کە قاچی ئاسنیان کردبێتە پێی ــ لەهەمانکاتیشدا ئاسکێک دەهێنمە پێشچاوی خۆم و کە چۆن بەخێرایی بەدەشتێکدا ڕادەکات.

ـ نا، نا، بۆ سەیرە. هیچ سەیر نییە.

# ماماۆستاکە

## بەشی دووەم

مۆریی ئەگەر ئەو چەند ساڵە لەو نەخۆشخانە دەروونییەی دەرەوەی واشنتۆن کاری نەکردایەوە نەدەبوو بەو مۆرییەی ئێستا. دوای بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر و دکتۆراکەی لە زانکۆی شیکاگۆ، مۆریی یەکەم کاری خۆی لەو نەخۆشخانە دەروونییەدا دەستپێکرد، کە ناوێکی دڵخۆشکەری هەڵخەڵتێنەری هەبوو. مۆریی هەر لەسەرتاوە ڕەتی کردبۆوە پزیشکیی، یان یاسا، یان کارگێڕی بخوێنێت، بڕیاری ئەوەی دابوو لەڕێگەی توێژینەوەوە، بەبێ ئەوەی ئازاری هیچ کەسێک بدات، خزمەتی خۆی پێشکەش بکات.

ئەرکی مۆریی لەو نەخۆشخانەیەدا ئەوەبوو چادێری نەخۆشە دەروونییەکان بکات و چارەسەرەکانیان تۆمار بکات. هەرچەندە ئێستا ئەوە کارێکی سادەیە و هەموو خەڵک دەزانێت چییە، بەڵام لە پەنجاکاندا کارێکی زۆر تازە و نامۆ بوو. مۆریی نەخۆشی دەبینی، کە بەردەوام هاواریدەکرد، نەخۆشی دەبینی تا بەیانی دەگریا، نەخۆشی دەبینی بەشەو خۆی پیس دەکرد، نەخۆشیش هەبوو نانی نەدەخوارد و دەبوو بێهۆش بکرێت، ئینجا لەڕێگەی دەمارەوە خواردنی پێبدرێت.

هەموو ڕۆژێک یەکێک لە نەخۆشەکان، کە ژنێکی تەمەن مامناوەند

بوو، لەژوورەکەی دەهاتە دەرەوە و لە یەکێک لەڕاڕەوەکاندا بەدەمدا پاڵدەکەوت. جار هەبوو بە چەند سەعات لەو سەر زەوییە دەمایەوە و پزیشک و سستەرەکان بەتەنیشتیدا تێدەپەڕین. هەموو ڕۆژێک ئەمەی دووبارە دەکردەوە: لەبەیانییەوە لەژوورەکەی دەهاتە دەرەوە، لە یەکێک لە ڕاڕەوەکاندا لەسەر زەویەکە پاڵدەکەوت تا ئێوارە، قسەشی لەگەڵ کەس نەدەکرد و کەسیش بەلایدا نەدەچوو. ئەم حاڵەتە مۆریی زۆر بێتاقەت کرد تا ئەوەی ڕۆژێک مۆریی بڕیاریدا بچێت لەتەنیشتییەوە لەسەر زەوییەکە دابنیشێت، تەنانەت پاڵیش بکەوێت. مۆریی هەوڵیدەدا ژنەکە لەو خەمە قووڵە دەربهێنێت، کە تێی کەوتبوو. دواجاریش توانی وای لێبکات هەستێت و بگەڕێتەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. مۆریی دەیزانی ئەو ژنە چی دەوێت: ئەو شتەی زۆربەی خەڵکی دەیانەوێت! ئەو ژنە دەیویست کەسێک بیبینێت و هەست بکات، کە ئەوە مرۆڤێکە و لەوێدا کەوتووە.

مۆریی پێنج ساڵ لەو نەخۆشخانەیەدا کاریکرد. هەرچەندە لای زۆر کەس شتێکی باش نەبوو، بەڵام لەگەڵ هەندێک لەنەخۆشەکاندا هاوڕێیەتیشی دروستکرد.

یەکێک لەو نەخۆشانەی ببوو بە هاوڕێی مۆریی ژنێک بوو، کە زوو زوو دەیگوت: من زۆر بەبەختم، کە هێناویانم بۆ ئەم نەخۆشخانە باشە، مێردەکەم دەوڵەمەندە و پارەکەی پێدەدرێ. ئەی ئەگەر لەیەکێک لەو نەخۆشخانە دەروونییە خراپانەدا بوومایە چیم بکردایە؟

ژنێکیتر، کە تفی لە هەموو کەسێک دەکرد، چوو بۆ لای مۆریی و بوو بەهاوڕێی. هەموو ڕۆژێک پێکەوە قسەیان دەکرد. ستافی نەخۆشخانەکە زۆر دڵخۆش بوون، کە لانیکەم کەسێک توانیویەتی قسە لەگەڵ ئەو ژنە بکات. ڕۆژێک ژنەکە ڕایکرد و

داوایان لە مۆریی کرد قسەی لەگەڵ بکات تا ڕازی بکات دووبارە بگەڕێتەوە بۆ نەخۆشخانەکە. دوای کەوتن و زانییان خۆی کردووە بە چ دوکانێکدا. ژنەکە لە بەشی دواوەی دوکانەدا خۆی شاردبۆوە. کاتێک مۆریی چووە ژوورەوە، ژنەکە زۆر بە توورەییەوە سەیرێکی کرد و بە مۆڕەکردن و ددان جیڕکردنەوەوە پێیگوت: کەواتە تۆش یەکێکی لەوان؟

- یەکێک لە کێ؟

- ئەوانەی منیان زیندانیی کردووە.

مۆریی درکی بەوەکرد، کە زۆربەی نەخۆشەکانی ئەو نەخۆشخانەیە لەژیانیاندا پشتگوێ خراوبوون و کەس گرنگیی پێنەداون، لەبەرئەوە ئەوانیش هەستیان بە بوونی خۆیان نەکردووە. ئەو نەخۆشانە خۆشەویستیی و سۆزیان پێنەدرابوو لەلایەن ستافەکە و دەوروبەرەکەیانەوە. زۆربەیان سەر بەخێزانی دەوڵەمەندبوون، بەڵام سامان ئاسوودەیی بۆ نەکڕیبوون. بۆ مۆریی ئەو ئەزموونە وانەیەک بوو، کە هەرگیز لەبیری نەچۆوە.

* * *

جارجار مۆرییم توڕە دەکرد و پێمدەگوت: دەزانی تۆ ئێستاش لە شەستەکاندا دەژی.

هەمیشە یەک وەڵامی دەدامەوە: شەستەکان لە ئێستا باشتربوو.

لە کۆتایی پەنجاکاندا مۆریی وازی لەکارکردن لە بواری نەخۆشی دەروونییدا هێنا و چووە زانکۆی براندایس بۆ وانە گوتنەوە. لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا زانکۆکە بووە جێگەی سەرهەڵدانی تەقینەوەیەکی کولتووریی گەورە: مادده بێهۆشکەرەکان و سێکس و ڕەگەزپەرستی و مانگرتن و خۆپیشاندان دژی جەنگی ڤێتنام

بزەبانکردە ناو زانکۆ. (ئابی هۆفمان) لەوێ بوو بەخوێندکار، دوای ئەویش (جێری ڕۆبن) و (ئەنجێلا دەیڤز). پۆلەکەی مۆریی چەندین خوێندکاری «گۆڕانخوازی»ی تێدابوو.

یەکێک لە هۆکارەکانی ئەمە ئەوە بوو، کە سەرۆکایەتیی بەشی کۆمەڵناسیی کارەکەی تەنها لەبواری بەروەدان بە پرۆسەی فێرکردندا نەمایەوە، بەڵکو چووە سیاسەتیشەوە. بۆ نموونە مامۆستاکانی بەشەکە بەتەواوەتی دژی هەموو جۆرە شەڕێک بوون، لەبەرئەوە کاتێک زانییان ئەگەر خوێندکار نمرەیەکی بەرز نەهێنێت بەسەرباز دەیگرن و بەشداریی (جەنگی ڤێتنام)ی پێدەکەن، هەموو پێکەوە بڕیاریاندا (سیستمی نمرە) پەیڕەو نەکەن. دواتر سەرۆکایەتی زانکۆ ڕایگەیاند، کە ئەگەر خوێندکاران نمرەیان نەبێت هەموویان بە دەرنەچوو ئەژمار دەکرێن. مۆریی چارەسەرێکی بۆهات. گوتی: کەواتە ئێمەش لە نەوەد کەمتر بۆ کەس دانانێین. دواتر پلانەکەشیان سەریگرت.

سالانی شەستەکان گۆڕانکاریی لە ستافی بەشەکەی مۆریی و تەنانەت لە تەواوی زانکۆکەشدا دروستکرد. لەوەبەدوا لەبەرکردنی کاوبۆ و پاپوچ و ئەو جۆرە جلوبەرگە نارەسمییانە بۆ زانکۆ بوو بەشتێکی ئاسایی و پۆلەکان ژینگەیەکی زیندووتریان بەخۆیانەوە بینی. مامۆستاکان پێیان باشبوو لەجیاتی بەردەوامبوون لەسەر ئەو وانانەی کە تیایاندا تەنها مامۆستا قسەی دەکرد، گفتوگۆ لەگەڵ خوێندکاراندا دروست بکەن و زیاتریش گرنگیی بە ئەزموون و لایەنی کرداریی بدەن وەک لە لایەنی تیۆریی.

زانکۆکە زۆر خوێندکاری نارد بۆ بەشەکانیتری وڵات بۆ ئەنجامدانی پرۆژەی پەیوەندیدار بە مافە مەدەنییەکانەوە و چەندین خوێندکاریتریشییان خستەبەر کاری مەیدانیی لەناوچە قەرەباڵغ و

پرتاوانەکانی شاردا. مامۆستا و خوێندکارەکان پێکەوە دەستیان کرد بەبەشداریکردن لە مانگرتنەکانی (واشنتۆن)دا و زۆربەی جارەکان مۆربی لەگەڵ خوێندکارەکانیدا بە پاس دەڕۆیشت بۆ خۆپیشاندانەکان. لەیەکێک لە خۆپیشاندانەکاندا مۆربی کۆمەڵێک ژنی بینی بە تەنورەی فش و ملوانکەی مووروەوە، گوڵیان دەخستەناو لولەی تفەنگی سەربازەکانەوە، دواتریش هەموو دەست لەناو دەست هاتن لەسەر چیمەنەکە و لەبەردەمی پنتاگۆن دانیشتن وەک ئەوەی بیانەوێت بیناکە بەرز بکەنەوە.

مۆربی گوتی: ڕاستە بیناکەیان بۆ نەجولا، بەڵام هەوڵێکی جوان بوو.

ڕۆژێکیتریشیان کۆمەڵێک خوێندکاری ڕەش پێست کۆنترۆڵی هۆڵێکی گەورەی (زانکۆی براندایس)یان کرد و لافیتەیەکی گەورەیان پێداهەڵواسی و لەسەریان نووسی: زانکۆی (ماڵکۆم ئێکس).

هۆڵەکە چەند تاقیگەیەکی کیمیایی تێدابوو، بۆیە لێپرسراوانی زانکۆ لەوە دەترسان ئەو توندڕەوانە لە ژێر زەمینی هۆڵەکەدا خەریکی دروستکردنی بۆمب و شتی وا بن. مۆربی باشتر لە مەسەلەکە تێدەگەیشت. ڕاستەوخۆ ناوەڕۆکی کێشەکەی دەبینی، کە زۆر بەسادەیی بەلای ئەوەوە بریتیی بوو لەوەی کە ئەو خوێندکارانە کۆمەڵێک مرۆڤن و دەیانەوێ هەست بە گرنگیی و بوونی خۆیان بکەن و هیچیتر.

کێشەکە تا چەند هەفتەیەک بەوشێوەیە درێژەی کێشا. ئەگەر مۆربی بەلای بیناکەدا نەڕۆیشتایە و یەکێک لە یاخیبووەکان بانگی نەکردایەتە ژوورەوە ڕەنگبوو زۆر زیاتر لەوەش بخایەنێت.

یەکێک لەوانەی لەژوورەوە بوو مۆربی دەناسی و دەیزانی یەکێکە لە مامۆستا باشەکان، بانگی مۆربی کرد و لە یەکێک لە پەنجەرەکانەوە بردیە ژوورەوە. دوای سەعاتێک مانەوە لەناو بیناکەدا،

مۆریی بەخۆی و لیستی داواکارییەکانی مانگرتووەکانەوە لەهەمان پەنجەرەوە هاتەوە دەرەوە. لیستەکەی برد بۆ لای سەرۆکی زانکۆ و دۆخەکە ئاسایی بۆوە. مۆریی هەمیشە ئاشتی لەگەڵ خۆی دەهێنا.

هەر لەزانکۆی براندایس مۆریی چەند ساڵێکی زۆر وانەی لەسەر سایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتی و نەخۆشییە دەروونییەکان گوتەوە. ئەو وانانە زیاتر بۆ بەرەوپێشبردنی لایەنی کەسایەتی خوێندکارەکان بوون، نەک ئامادەکردنیان بۆ دونیای کار.

ڕەنگە ئێستا خوێندکارەکانی بەشی یاسا و کارگێڕی گاڵتەیان لەو شتانە بێت، کە مۆریی فێری خوێندکارەکانی بەشی کۆمەڵناسیی کردووە، چونکە ئەوەی مۆریی دەیکرد بەرەوپێشبردنی ئاستی خوێندکارەکانی بوو لەڕووی «کەسایەتی»ەوە، نەک لەڕووی «پیشەیی»ەوە. ڕەنگە خوێندکاری ئەو بەشانەیتر بڵێن: ئادەی پێمبڵێ ئەوانەی مۆریی وانەی پێگوتن ئێستا ڕۆژی چەند پەیدا دەکەن؟ تا ئێستا چەند دۆسییەی گەورەیان لە دادگاکاندا بردۆتەوە؟

منیش دەڵێم: ئەی چەند خوێندکاری بەشی یاسا و کارگێڕی دوای دەرچوونیان سەردانی مامۆستا کۆنەکانیان کردەوە؟ مۆریی تا دوا ساتەکانی ژیانی خوێندکارەکانی لەگەڵی بوون. لەمانگەکانی کۆتایی تەمەنیشیدا هەموویان بە دەیان و سەدان گەڕانەوە بۆ لای، لە (بۆستن)ەوە، لە (نیویۆرک)ەوە، لە (کالیفۆرنیا)وە، لە (لەندەن)ەوە، لە (سویسرا)وە، لە نووسینگە گەورەکان و لە قوتابخانەی ناوچە هەژارنشینەکانەوە، لە دووری سەدان میلەوە دەهاتن بۆ لای بۆ سەردانێکی کورت، بۆ وشەیەک، بۆ زەردەخەنەیەک، هەمووشیان یەک قسەیان دەکرد: تۆ باشترین مامۆستام بووی لەژیانمدا!

***

لەگەڵ بەردەوامبوونی سەردانەکانمدا بۆ لای مۆریی، وردە وردە دەستەکەم بەخوێندنەوە لەسەر مردن. هەوڵدەدەم بزانم کولتوور و کۆمەڵگا جیاوازەکان چۆن ئەم قۆناغە کۆتاییەی ژیان دەبینن، کە ناونراوە (مردن). لە خوێندنەوەکانمدا هەندێ شتی سەرنجڕاکێش دێنە بەردەمم. بۆ نموونە خێڵێک هەن لە جەمسەری باکووری زەوی بڕوایان وایە هەموو شتێکی سەر ئەم دونیایە ڕۆحی هەیە و ئەو ڕۆحەش لەهاوشێوەیەکی بچووکی ئەو جەستەیەدایە، کە هەڵیگرتووە، واتە ئاسکێک ئاسکێکی بچووکیشی تێدایە و پیاوێکیش پیاوێکی تری بچووکی تێدایە. کاتێکیش جەستە گەورەکە دەمرێت، ڕۆحەکە لە جەستە بچووکە هاوشێوەکەدا هەر بەردەوام دەبێت لە ژیان. دەکرێت ڕۆحەکە بچێتە شتێکەوە، کە لە نزیکییەوە لەدایک دەبێت، یان دەکرێت بچێتە شوێنێک لە ئاسمانەکان و بۆ ماوەیەک لەوێ پشوو بدات، یان دەشێت بچێتەوە ناو ڕۆحێکی گەورەی مێ وە و لەوێدا چاوەڕێ بکات تا ئەو کاتەی مانگ دەینێرێتەوە بۆ سەر زەوی.

هەندێکجار ئەو خێڵە دەڵێن، مانگ زۆر سەرقاڵە بە ڕێکخستنی ڕۆحە زیندووەکانی سەر زەوییەوە بۆیە ناوبەناو ئاسمان بەجێدەهێڵێت و هەندێک شەو مانگ نابینین، بەڵام لە کۆتاییدا هەر دەگەڕێتەوە و ئێمەش لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە بۆ ئێرە.

ئەمە بڕوای ئەو خێڵەیە.

## سێشەممەی حەوتەم

# باسی ترس لەپیربوون دەکەین

تەواو، مۆریی شەڕەکەی دۆڕاند. ئێستا دەبوو یەکێک دواوەی بۆ پاک بکاتەوە. مۆریی زۆر بەئازایەتییەوە ڕووبەڕووی ئەم شتە ناخۆشە بۆوە. ئەو چیتر نەیدەتوانی دەستی بگەیەنێتە بەشی دواوەی خۆی پاکی بکاتەوە لەبەرئەوە کۆنیی لەمەسەلەکە ئاگادار کردەوە و پێیگوت: ئەگەر پێت شەرم نەبێ مەمنونت دەبم ئەوەشم بۆ بکەی.

کۆنیی بەلایەوە ئاسایی بوو.

سەیر نەبوو، کە بۆ شتێکی ئاوا مۆریی یەکەمجار داوای لە کۆنیی کرد، بەڵام دواتر دانی پێدانا، کە ماوەیەکی ویستووە تا بەو شتە ڕاهاتووە، چونکە ئەنجامدانی ئەو کارە بۆی لەلایەن کەسێکی ترەوە ئەوپەڕی خۆبەدەستەوەدان بووە بۆ نەخۆشییەکەی.

ئەو گۆڕانکارییە کەسییترین شتی لە مۆریی ستاند و سپاردی بە کەسێکی تر. مۆریی چیتر نەیدەتوانی بەتەنیا بچێت بۆ سەرئاو، لوتی خۆی پاک بکاتەوە و دواوەی خۆی بشوات. تەنها هەناسەدان و قوتدانی خواردنەکەی لەسەر بوو، بۆ هەموو شتێکیتر پشتی بەدەوروبەرەکەی دەبەست.

لێم پرسی کە چۆن دەتوانێت لە بارێکی ئاوادا بە بیرکردنەوەیەکی باشەوە بژی.

وەڵامی دامەوە: میچ! نازانم چۆن بیڵێم! بەڵام من کەسێکم سەربەخۆم، هەر لەبەرئەوەش بوو دەمویست بەتەنها شەڕ لەگەڵ نەخۆشییەکەم بکەم، لەگەڵ ئەوەشدا، کە خۆم نەمدەتوانی بچمە ناو سەیارە و دابەزم، یان خۆم بگۆڕم. سەرەتا کە دەمبینی کەسانێتر ئەو کارانەیان بۆ دەکردم هەستم بە شەرمەزاری دەکرد، چونکە کولتوورەکەمان پێمان دەڵێ دەبێ شەرمەزار بین ئەگەر نەتوانین دواوەی خۆمان پاکبکەینەوە. بەڵام دواتر بۆم دەرکەوت، کە دەبێ لەمێشکی خۆمی دەرکەم کولتوور چی دەڵێ و چی ناڵێ. من زۆربەی ژیانم کولتوورم پشتگوێ خستووە. بەشتی واش شەرمەزار نابم، بۆ شەرمەزار ببم؟! یەک شتیتریش؟

- چی؟

- خەریکە وام لێدێ چێژ لەوە دەبینم، کە ئاوا پشتم بەستووە بە دەوروبەرەکەم. ئێستا چێژی لێوەردەگرم کاتێک دەمخەنە سەر پشت و کرێمم لێدەدەن بۆئەوەی پێستم نەسووێتەوە، یان کاتێک ناوچاوانم دەسڕن، یان کاتێک قاچم دەشێلن، تەواو دەچمە ناویەوە. چاوەکانم دادەخەم و هەستی پێدەکەم. ئاوا شتەکە تامێکیتری هەیە. وەک ئەوە وایە دووبارە بگەڕێیتەوە بۆ منداڵیی. یەکێکت دەوێت بتشوا، یەکێک لەباوەشت بکا و بەرزت بکاتەوە. یەکێک دەموپلت بسڕێ. ئێمە هەموومان دەزانین چۆن منداڵ ببینەوە، ئەوە لەناخی هەمووماندایە. من تەنها دەمەوێ لەچێژ لێوەرگرتنەکەدا منداڵ ببمەوە.

کاتێک دایکمان هەڵیدەگرتین، یاری لەگەڵ دەکردین، دەستی بەسەردا دەهێنایین، کەسمان لەو شتانە تێر نەدەبووین. دواتریش هەموومان بەشێوەیەک لەشێوەکان تامەزرۆی ئەوە بووین بگەڕێینەوە بۆ ئەو ڕۆژانە، ئەو ڕۆژانەی تائەوپەڕی چاودێریی دەکراین، بەبێ مەرج خۆشدەویستراین و هەر بەبێ مەرجیش زۆرترین گرنگییمان

پێنەدرا. زۆربەمان هەرگیز تێرمان نەخوارد. من خۆم ئێستا و
ئەوساش تێر نەبووم.

سەیرێکی مۆریم کرد و تێگەیشتم لەوەی بۆچی ئەوەندە چێژی
لەوە دەبینی، کە بەسەریدا دەچەماومەوە و مایکرۆفۆنەکەم بۆ
چاکدەکرد، یان سەریم لەسەر سەرینەکە دەجولاند، یان کە چاویم
دەسڕی. ئەوەی مۆری چێژی لێدەبینی بەریەککەوتنی مرۆڤانەی من
و ئەو بوو. لەتەمەنی حەفتا ساڵیدا بوو کەچی هێشتا وەک کەسێکی
پێگەیشتوو دەیبەخشی و وەک منداڵێک وەریدەگرت.



ئەو ڕۆژە باسی پیربوونمان کرد، یان بابڵێم «ترس لەپیربوون،»
یەکێکیتر لە بابەتەکانی ناو لیستەکەم. کاتێک لە فڕۆکەخانەی
(بۆستن)ەوە بەڕێگاوە بووم بۆماڵی مۆری، هەموو ئەو ڕیکلامانامەم
بینی، کە لەسەر شەقامەکان بۆ سەرنجڕاکێشانی خەڵک دانرابوون و
کەسەکانی ناویان گەنج و جوان بوون. لەیەکێکیاندا وێنەی کوڕێکی
قۆز دانرابوو، کە بە خۆی و کڵاوە تەکساسییەکەی و جگەرەکەی
دەمییەوە سەیری کامێرەکەی کردبوو، لەیەکێکیتردا وێنەی دوو ژنی
گەنجی جوانی دەم بەخەندە لەسەر بتڵی شامپۆیەک، یەکێکیتر
وێنەی هەرزەکارێک بەکاوبۆیەکی زنجیر دانەخراوەوە، یەکێکیتر ژنێکی
جوان بە عەزییەکی قەیفەوە و لەتەنیشتییەوە پیاوێک بە قاتێکی
کەشخەوە، هەردووکیشیان بەسەر و پەرداخ ویسکییەوە.

کەسم نەبینیبوو سی و پێنج ساڵی تەواوکردبێت و کەمێک
بێتاقەت نەبووبێت. منیش لای مۆری دانم پێدانا، کە خەریکبوو
بەهەڵکشانی تەمەنم بێتاقەت دەبووم. بەردەوام وەرزشم دەکرد و لە
خواردنیشدا زۆر وریای خۆم بووم، زوو زووش سەیری قژمم دەکرد

لەئاوێنەدا. جاران بەشانازییەوە باسی تەمەنی خۆمم دەکرد و بەو شتانەوە دەنازیم، کە لەو تەمەنە کەمەدا بەدەستم هێنابوون، بەڵام ئێستا نەمدەویست کەس باسی بابەتی تەمەنم لەگەڵ بکات، چونکە بیرم دەهاتەوە، کە خەریکە دەبم بە چل ساڵ و ئیتر وردە وردە لەکارەکەمدا بەرەو دواوە دەچم.

مۆریی لەگۆشەنیگایەکی باشترەوە سەیری پیربوونی دەکرد.

- میچ، من بە شتێکی ڕاستی نازانم ئەوەندە جەخت لەسەر گەنجێتی بکرێتەوە. من دەزانم خەمەکانی سەردەمی گەنجیی چین. لەبەرئەوە پێویست ناکات پێمبڵێی، کە گەنجیی وا خۆشە و وا گەورەیە. هەر یەکێک لەو گەنجانە بگری، کە هاتوون بۆ سەردانم کۆڵێک کێشە و ململانێیان هەبووە و هەیە لەژیانیاندا، زۆربەیان هەستیان وابووە، کە لەشتێک یان چەند شتێکدا شکستیان هێناوە، تەنانەت هەندێکیان بەشێوەیەک خەمباربوون بیریان لەوەکردۆتەوە خۆیان بکوژن.

سەرەڕای ئەو هەموو خەم و قورسییانە، گەنجان ژیریش نین. ئەوان زۆر کەم لە ژیان تێدەگەن. بێگومان کەسێک نەزانێ چی لە ژیانیدا دەگوزەرێ نایەوێ بژی. کاتێک خەڵک بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکارت دەهێنن، پێتدەڵێن: ئەم بۆنە بکڕە و جوان دەبی. ئەو کاوبۆیە لەبەرکە و سەرنجڕاکێش دەرکەوە. تۆش بڕوایان پێدەکەی بەڕاستی شتێکی بێمانایە.

لێم پرسی: باشە تۆ قەت لەپیربوونی خۆت نەترساوی؟

لەسەرخۆ وەڵامی دامەوە: میچ، من ئامێزم بۆ پیریی کردۆتەوە.

- ئامێزیشت بۆ کردۆتەوە؟!

- بەڵێ، شتەکە زۆر سادەیە. مرۆڤ لەگەڵ گەورەبوونیدا فێر دەبێ. ئەگەر لە تەمەنی بیست و دوو ساڵیدا بمێنیتەوە، ئەوکاتە چەندە

دەزانی ئیتر هەر ئەوەندە دەبێ و زیاد ناکات. کێشەکە ئەوەیە ئێمە هەڵکشانی تەمەن تەنیا بە پیربوون و تێکچوون دەزانین، بەڵام خۆی لەبنەڕەتدا هەڵکشانی تەمەن گەشەکردنیشە. پیربوون نابێ تەنها ئەو بیرە خراپە بخاتە مێشکمانەوە، کە تەواو ئیتر ئێمە بەرەو مردن دەڕۆین، بەڵکو دەبێ ئەو بیرە باشەشمان لا دروست بکات، کە «تێدەگەین بەڕاستی بەرەو مردن دەڕۆین». ئەو تێگەیشتنە وادەکات ژیانمان خۆشتر بێ.

- ڕاست دەکەی، بەڵام باشە ئەگەر پیربوون ئەوەندە بەنرخە و فێرت دەکات ژیانێکی باشتر بژی، بۆچی خەڵک دوای ئەوەی پیر دەبن دەڵێن: ئاخ ئەگەر ئێستا گەنج دەبوومەوە. قەت گوێت لە کەسێک نابێ گەنج بێ و بڵێ: ئای خۆزگە ئێستا شەست و پێنج ساڵ دەبووم.

مۆریی زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: دەزانی ئەوە چیمان پێدەڵێ؟ ئەوە پێمان دەڵێ ئەو کەسانە ژیانێک نەژیاون دڵی پێخۆشبکەن، هیچی وایان لەژیانیاندا بەدەست نەهێناوە، ژیان لای ئەوان تێپەڕیوە و ماناکەیان نەدۆزیوەتەوە. مرۆڤ ئەگەر مانای لەژیانی خۆیدا دۆزیبێتەوە نایەوێ بگەڕێتەوە بۆ دواوە، بەڵکو دەیەوێ بەرەو پێشتر بڕوا، زیاتر ببینێ و زیاتر بکات. نابێ چاوەڕێ بکەی تا دەبی بە شەست و پێنج ساڵ.

سەیرکە میچ، شتێک هەیە دەبێ تۆ بیزانی، لەڕاستیدا شتێک هەیە دەبێ هەموو گەنجێک بیزانێ: ئەگەر هەمیشە لەشەڕدابی لەگەڵ پیربوون، لە گەنجێتییدا ئاسوودە نابی، چونکە دواجار پیربوون هەر ڕوودەدا.

یەک شتیتریش!

دەنگی نزم کردەوە و گوتی: ئەوەی ڕاستی بێ مردنەکەش هەر

ڕوودەدا.

سەرم بۆ لەقاند.

- گرنگ نییە تۆ چی بەخۆت دەڵێی.

- ڕاستە.

دوای ئەوە گوتی: بەڵام هیوادارم تەمەنێکی درێژ درێژت هەبێ.

بەئارامییەوە چاوەکانی داخست و داوای لێکردم سەرینەکەی ژێر سەری کەمێک بجوڵێنم. زوو زوو دەبووایە لەشی بجوڵێنیت بۆئەوەی لەیەک باردا نەمێنێتەوە و بێزار ببێت. سەرجێگاکەی چەند سەرینێکی سپی و ئیسفەنجی زەرد و چەند خاولییەکی شینی لەسەربوو. بۆ ساتێک واهاتە بەرچاوم پیاوێک بێت پێچابێتیانەوە پۆستی بکەن بۆ شوێنێک.

کاتێک سەرینەکانم دەجوڵاند بەدەنگێکی زۆر نزم گوتی: سوپاس، دەستخۆش.

- شایانی نییە.

لێی پرسیم: میچ، ئەی تۆ دەڵێی چی؟

پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە کەمێک وەستام: بیر لەوە دەکەمەوە، کە تۆ چۆن ئیرەییت بە کەسانی گەنج و تەندروست نایەت!

وەڵامی دایەوە: نا، نا، ئیرەییم پێیان دێ. چاوەکانی داخست و بەردەوامبوو: لەوەدا ئیرەییم پێیان دێ، کە دەتوانن بچنە دەرەوە و بۆ وەرزشکردن، بڕۆن بۆ مەلە و بۆ سەما، زیاتر بۆ سەماکە. لێت ناشارمەوە هەستی ئیرەیی بوون لەناومدا دروست دەبێ، ئەزموونی دەکەم، بەڵام ناهێڵم زۆر تیامدا بمێنێتەوە. بیرتە چیم پێگوتی لەسەر خۆدابڕاندن لە هەستەکانت. بەریدە بابڕوا، بەخۆت بڵێ: ئێ ئەوە ئیرەیییە و منیش ئێستا لێی جیادەبمەوە و چیتر لەخۆمدا نایهێڵم. ئیتر ئاوا لێی دوور بکەوەرەوە.

کۆکەیەکی درێژ کۆکی، ئینجا دەستەسرێکی خستەسەر دەمی و بەبێهێزی تفێکی تێکرد. من کە بە تەندروستییەکی باشەوە لەوێ دانیشتبووم هەستمدەکرد زۆر بەهێزترم لەو ئەوەندە بەهێز، کە بتوانم وەک لەردە ئاردێک هەڵیگرم و بیدەم بەشانمدا. ئەم بەهێزییەم شەرمەزاری دەکردم لەبەرئەوەی لەهیچ لایەنێکیترەوە لە مۆریی بەهێزتر نەبووم.

لێیم پرسی: تۆ چۆن دەتوانی، کە ئیرەیی نەبەیت بە...

- بەچی؟

- بۆ نموونە بە...من.

زەردەخەنەیەکی کرد: بێگومان پیرەکان ئیرەیی بە گەنجەکان دەبەن، بەڵام گرنگ ئەوەیە خۆت وەک ئەوەی هەیت قبوڵ بکەی و بەخۆشی لەگەڵ خۆتدا بژی. ئێستا بۆ تۆ ئەو کاتەیە، کە دەبێ سی ساڵ بی، منیش بە سی ساڵییدا ڕۆیشتووم و ئێستا کاتی ئەوەمە حەفتا و هەشت ساڵ بم.

میچ، تۆ دەبێ شتە جوان و خۆش و ڕاستەکانی ناو ژیانی ئێستات بدۆزیتەوە. گەڕانەوە بۆ ڕابردوو مرۆڤ دەکاتە ڕکابەرێکی سەرسەخت، بەڵام لەڕاستیدا تەمەن بابەتێک نییە پێویست بکات سەرسەختانە مامەڵەی لەگەڵ بکەی.

هەناسەیەکی دایەوە و چاوەکانی نزمکردەوە وەک ئەوەی بیەوێت سەیری هەناسەکەی بکات چۆن لەهەواکەدا بڵاودەبێتەوە: میچ، ڕاستییەکە ئەوەیە بەشێک لە من لە هەموو تەمەنێکدایە، منداڵێکی سێ ساڵم، پێنج ساڵم، سی و حەوت ساڵم، پەنجا ساڵم... لەهەموو ئەو تەمەنانەدا ژیاوم و دەزانم چۆنن. کاتێک گونجاوە منداڵ بم منداڵ دەبم و چێژیشی لێوەردەگرم، کاتێکیش گونجاوە پیرەمێردێکی بنیادیدەی ژیر بم، دەبم و چێژ لەویش وەردەگرم. بەووردی بیرێک

چارەنـووس هەمـوو زینـدەوەران دەخاتـە ژێـر کۆنترۆڵـی خۆیـەوە، یـەك دانـە نەبێـت، کـە خـۆی جیـا دەکاتـەوە و خـۆی دەخاتـە مەترسـییەوە[1].

دەبلیو ئێچ ئۆدن
شاعیری ژمارە یەکی (مۆریی)

---

[1] مانـای وتەکـەی ئـۆدن ئەوەیـە، کـە چارەنووسـی مرۆڤـەکان لەدەسـتی مرۆڤـەکان خۆیاندایـە، لەبەرئـەوەی مـرۆڤ توانـاو ئامـرازی بەڕێوەبردنـی ژیانـی دراوەتـێ و دەتوانـێ بـە کارەکانـی بـەرەو ئاسـوودەیی، یـان بـەرەو مەترسـیی بـڕوات.

# سێشەممەی هەشتەم

## باسی پارە دەکەین

ڕۆژنامەکە بەرزدەکەمەوە بۆ ئەوەی مۆریی بتوانێت ناونیشانی بابەتەکە ببینێت:

نامەوێت لەسەر کێلی قەبرەکەم بنووسن: مرد و هەر نەبوو بەخاوەنی ئەو دەزگا گەورەییەی خەونی پێوە دەبینی.

مۆریی پێکەنی و سەرێکی بادا. تیشکی خۆری ئەو بەیانییە لە پەنجەرەکەی پشتییەوە دەهاتە ژوورەکەوە و لەو گوڵە پەمەییانەی دەدا، کە لەسەر تاقی پەنجەرەکە دانرا بوون.

ئەو قسەیەی سەرەوە، کە لەڕۆژنامەکەدا نوسرا بوو قسەی (تێد تێرنەر)ە. تێرنەر ملیاردێرێکی بواری ڕاگەیاندن و دامەزرێنەری کەناڵی (سی ئێن ئێن)ی جیهانییە. ئەو پیاوە ماوەیەکی زۆر بێتاقەتی ئەوە بوو، کە نەیدەتوانی دەستبەسەر دەزگای ڕاگەیاندنی (سی بی ئێس) دا بگرێت. ئەو بەیانییە بەمەبەست ئەو هەواڵەم برد بۆ مۆریی لەبەرئەوەی دەمویست بزانم ئەگەر تێرنەر بۆ یەک جاریش خۆی لەدۆخی مۆرییدا ببینیایە، بۆ نموونە ئەگەر توشی ئەو هەناسە قورسییەی مۆریی ببووایە، یان ئاوا جەستەی لاواز ببووایە، یان وەک مۆریی بەچاوی خۆی ببینیایە چۆن ڕۆژەکانی تەمەنی یەک بەدوای یەک لەسەر ڕۆژژمێرەکان کەمدەبنەوە، تۆ بڵێی ئەو کاتەش

بەڕاستی بگریایە بۆئەوەی نەیتوانیوە دەست بەسەر ڕاگەیاندنی (سی بی ئێس)دا بگرێت؟

مۆریی کەوتە ڕوونکردنەوەی بابەتەکە بۆم: میچ، ئەم شتانە هەموویان بەشێکن لە یەک کێشەی سەرەکی گەورەتر. ئێمە بەها و گرنگیی پێدانمان دەبەخشینە شتە هەڵەکان، ئەوەش ئەنجامەکەی ژیانێکی چاوەڕواننەکراوی فریودەر دەبێ. وابزانم خراپ نییە باسێکی ئەوەش بکەین.

مۆریی مێشکی زۆر بەباشی ئیشی دەکرد. ڕاستییەکەی ڕۆژی باش و خراپ، خۆش و ناخۆشی هەبوو. بەختی من ئەو ڕۆژە لە باشەکان بوو. شەوی پێشوو گروپێک گۆرانیبێژی لاو هاتبوون بۆ سەردانی و نمایشێکیان لەبەردەمیدا کردبوو. مۆرییش چیرۆکی شەوی پێشووی زۆر بەشەوق و زەوقەوە بۆ گێڕامەوە وەک ئەوەی گروپێکی جیهانیی هاتبن بۆلای.

مۆریی زۆر حەزی لە مۆسیقا و گۆرانی بوو تەنانەت پێش ئەوەش، کە نەخۆش بکەوێت، بەڵام ئێستا ئەو حەزەی زۆر زیاتر بوو بەڕادەیەک لەگەڵ گوێ گرتن لە مۆسیقا و گۆرانییەکاندا دەگریا. هەندێکجار شەوانە گوێی لە (ئۆپێرا) دەگرت و بەچاوی داخراوەوە لەسەر لەرەی دەنگە گۆرانیبێژە ئۆپێراییەکان بۆ دوور دەڕۆیشت.

- میچ خۆزگە دوێنێ شەو لێرە دەبووی! بەڕاستی گروپێکی جوان و دەنگ خۆش بوون.

مۆریی هەمیشە بەچالاکییە بچووکەکانی گۆرانی گوتن و سەماکردن و پێکەنین دڵی زۆر خۆشدەبوو. لەئێستادا شتە مادییەکان لەهەموو کاتێکیتر لەلای مۆریی بێبایەخ ببوون. زۆرجار کاتێک کەسێک دەمرێت، خەڵک دەڵێن: مرۆڤ کە مرد چۆن هاتووە دەبێ ئاوا بکەڕێتەوە. ناتوانێ هیچ بەرێ.

دیاریوو مامۆستا کۆنەکەم دەمێک بوو ئەمەی زانیبوو.

بەئاه هەڵکێشانەوە گوتی: لەئێستادا و لەم وڵاتەی ئێمەدا پرۆسەیەکی مێشک شتنی گەورە بەڕێوەدەچێ. دەزانی چۆن مێشکی خەڵک دەشۆن؟ بەردەوام شتێک دەڵێن و دەیڵێنەوە. ئێستا ئێمە لەم وڵاتەدا خەریکی ئەمەین: تا سەروەت و سامانت زۆرتر بێ باشترە، پارەی زۆرتر باشترە، ماڵ و موڵکی زیاتر باشترە، بازرگانی گەورەتر باشترە، زیاتر و زیاتر هەمیشە باشترە... بەردەوام ئەمە دووبارەی دەکەینەوە و خەڵکیش لە ئێمەی دووبارە دەکاتەوە. ئەوەندە دووبارەی دەکەینەوە، کە هیچ کەس نامێنێ بەپێچەوانەی ئەوەوە بیر بکاتەوە. بەشێوەیەکی گشتی ئەم بۆچوونە بەرچاوی خەڵکی لێڵ کردووە و خەڵک چیتر شتەکان وەک خۆیان نابینن و نازانن بەڕاستی چی گرنگ و باشە.

لەژیانمدا بۆ هەر کوێیەک چووبم، تووشی خەڵکانێک بووم، کە پەلەی ئەوەیان بووە زووتر بگەنە قۆناغی داهاتوو. بۆنموونە پەلەی کڕینی سەیارەیەکی تازەیان بووە، پەلەی کڕینی خانوو و موڵکی زیاتر، یان ئامێر و شتیتر، دوای ئەوەش ویستوویانە باسی ئەو شتانە بۆ خەڵک بکەن و بە شانازییەوە بڵێن: تۆ بڵێ چیم کڕی؟ تۆ بڵێ چیم بەدەستهێنا؟

دەزانی هەمیشە ئەمەم چۆن لێکداوەتەوە؟ ئەو کەسانە زۆر لەڕاد تینووی خۆشەویستیی بوون و دەستیان نەکەوتووە بۆیە ناچار ئەو بۆشاییەیان بەشتیتر پڕکردۆتەوە. شتە مادییەکانیان لەئامێز گرتووە و چاوەڕێی ئەوە بوون شتەکانیش باوەشیان پێدابکەنەوە و ناسوودەیان بکەن، بەڵام خۆت دەزانی شتی وا هەرگیز ڕوونادا. هیچ شتێکی مادیی جێگای خۆشەویستیی، نەرمونیانیی، ئاسکیی و لەگەڵ یەکبوون پڕناکاتەوە.

پارە و مێز جێگرەوەی ئەرمونیانیی نین. من بەمزووانە دەمرم لەبەرئەوە دەتوانم پێتبڵێم، نە پارە و نە دەسەڵات ئەو هەستە پێنابەخشن، کە بەدوایدا دەگەڕێی، هەرچەندێکیشت لێیان هەبێ!

چاوێکم بە ژوورەکەدا گێڕا. لەیەکەم سەردانمەوە تا ئێستا هیچی تێدا نەگۆڕابوو، کتێبەکان هەر لەجێی خۆیان بوون لەسەر ڕەفەکان، ڕۆژنامەکان لەسەر هەمان مێز کەڵەکە کرابوون، ژوورەکانی تریش بەهەمانشێوە بوون. ماوەیەکی زۆر بوو مۆریی جگە لە هەندێک ئامێری چارەسەریی پزیشکیی، هیچی تازەی نەکڕیبوو بۆ ماڵەکە.

هەر لەو ڕۆژەوەی بۆی دەرکەوت نەخۆشییەکەی کوشندەیە حەزی لەوە نەما لەڕێگەی کڕینی شتەکانەوە بوون و گرنگیی خۆی گەورە بکات، هەرلەبەرئەوە تەلەفیزیۆنەکە هەر هەمان تەلەفیزیۆنەکەی ئەوکاتە بوو، سەیارەکەش هەر ئەو سەیارەیە بوو، کە شارلۆت ئەوکاتە پێی بوو، تەنانەت قاپ و کەوچک و خاولییەکانیش هەر کۆنەکان بوون، لەگەڵ ئەوەشدا ماڵەکە زۆر گۆڕابوو، پڕببوو لە خۆشەویستیی و فێرکردن و پەیوەندیکردن لەگەڵ یەکتر، پڕ ببوو لە هاوڕێیەتیی و خێزان و ڕاستگۆیی و فرمێسک، پڕ ببوو لە خوێندکار و مامۆستا و مامۆستای ڕۆحیی و چارەسەرکاری سروشتیی و سستەر و گرووپی گۆرانی گوتن، بەڕاستی ماڵەکەی مۆریی ببوو بە ماڵێکی دەوڵەمەند هەرچەندە حسابە بانکییەکەی مۆریی خەریک بوو هیچی تێدا نەدەما!

- میچ، لەم وڵاتەدا خەڵک لەنێوان دوو شتدا سەریان لێتێکچووە: لەنێوان ئەو شتەدا، کە خۆیان دەیانەوێ و ئەو شتەی بەڕاستی پێویستیانە. تۆ پێویستت بە خواردنە بۆ ئەوەی بژی، کەچی لەولاوە ئایسکرێمی سەرقاوەت دەوێ! دەزانی ئەوەی ئێمە پێویستمانە تازەترین مۆدێلی سەیارە نییە، ئەوەیە لەگەڵ خۆمان ڕاستگۆبین.

پێویست ناکات خانووەکانمان سێ ئەوەندە و چوار ئەوەندەی پێویستیی خۆمان گەورەبن. ئەگەر ڕاستیشت دەوێ ئەو شتانە هەرگیز ئاسوودەیی ڕاستەقینەیان پێنیییە بۆ مرۆڤ. تۆ دەزانی چ شتێک بەڕاستی واتلێدەکات لەژیانی خۆت ڕازی بی و دڵت بە ژیانت خۆش بێ؟

- چی؟

- ئەوە بە دەورووبەرەکەت ببەخشی، کە دەبێ بیبەخشی.

- بەقسەکانتدا دەڵێی ئەندامی گروپی دیدەوانی قوتابخانەی.

- مەبەستم پارە نییە میچ! مەبەستم کات و گرنگیی پێدانتە، مەبەستم چیرۆکەکانی ژیانتە. ئەوەش کارێکی قورس نییە. سەنتەرێک هەیە لەم نزیکانە کراوەتەوە. ڕۆژانە چەندین بەساڵاچوو سەردانی دەکەن، ئەگەر کوڕێک، یان کچێکی گەنج بی و بەهرەی شتێکت هەبێ، داوات لێدەکەن بچی و بیگەیەنی بە خەڵکیتریش. با بڵێین تۆ لە کۆمپیوتەردا شارەزای، دەچی بۆ ئەو سەنتەرە و ئەو بەساڵاچووانەی دێن تۆ فێری کۆمپیوتەریان دەکەی. زۆر ڕێزت لێدەگرن و زۆریش بەکارەکەت دەزانن. بەمشێوەیە دەست دەکەی بەبنیاتنانی ڕێزێکی زۆر بۆ خۆت، لەڕێگەی بەخشینی شتێکەوە، کە هەتە. زۆر شوێنیتری هاوشێوەی ئەو سەنتەرە هەن. مەرج نییە بەهرەکەت بەهرەیەکی زۆر گەورە و ناوازە بێت. لەنەخۆشخانە و بنکەکانی چاودێری بێلانە و بەساڵاچووەکاندا چەندین کەس هەن تەنها پێویستییان بەوەیە کەمێک هەستی هاوڕێیەتییان بدەیتێ، کەمێک لەتەنیشتیانەوە دانیشی. کۆنکەنێک لەگەڵ پیاوێکی پیر دەکەیت و ڕێزێکی زیاتر بۆ خۆت پەیدادەکەی، چونکە هەست دەکەی تۆ کەسێکیت دەورووبەرەکەت پێویستییان پێتە و گرنگیی خۆتت هەیە. بیرتە چیم پێگوتی لەسەر پێکەوەنانی ژیانێکی پڕمانا؟

لای خۆم نووسیومە و بۆت دەخوێنمەوە: مرۆڤ بەوە دەتوانێ مانا بۆ ژیانی بگەڕێنێتەوە، کە ژیانی تەرخانبکات بۆ خۆشەویستنی کەسانیتر، بۆ دەوروبەر و کۆمەڵگاکەی، بۆ هێنانە کایەی شتێک کە مانا و ئامانج بەژیانی ببەخشێ.

تفێکی قوتدا و بە پێکەنینێکەوە بەردەوام بوو: تۆ سەیرکە، لەو شتانەدا کە ناومهێنان باسی مووچە و پارەی تێدا نەبوو!

لەکاتێکدا مۆریی ئەم قسانەی دەکرد، من سەرم داخستبوو، هەندێک لە قسەکانم لەسەر پارچە کاغەزێکی زەرد دەنووسییەوە. لەڕاستییدا، ئەمکارەم زیاتر بۆ ئەوە بوو مۆریی چاوی لەچاوم نەبێ و نەستەبەجێ نەزانێ بیر لەچی دەکەمەوە. منێک کە هەر لەدوای دەرچوونمەوە لەزانکۆ بەبەردەوامی بەدوای ئەو شتانەدا ڕامدەکرد، کە مۆریی دژیان قسەی دەکرد، ئیتر لەکوێ ڕووی ئەوەم هەبوو سەیری ناوچاوی بکەم. لەبەرئەوەش کاری من لەگەڵ وەرزشکارە دەوڵەمەند و بەناوبانگەکان بوو، دەمێک باوەڕم بەوە هێنابوو، کە ئەو شتانەی دەمەوێن بەڕاستی پێویستیشن، چاوچنۆکییەکەی من لەوەی ئەوانەوە سەرچاوەی گرتبوو.

بەڕاستی بابەتەکە لای من هێشتا لێڵ بوو، بەڵام مۆریی بەمشێوەیە بەجوانی بۆی ڕوونکردمەوە: میچ، ئەگەر هەوڵی ئەوە نەدەی لای ئەو کەسە دەوڵەمەند و بەناوبانگانە دیاربی، وازی لێبێنە، چونکە ئەو کەسانە ئەوکاتەش هەر بە کەم لە تۆ دەڕوانن. ئەگەر هەوڵیش نەدەی لای چینە هەژارەکە دیاربی و ناوت هەبێ، ئەوەش وازی لێبێنە، چونکە ئەوانیش تەنها ئیرەییت پێدەبەن. مەبەستەکەم ئەوەیە پلەوپایە ناتگەیەنێتە هیچ شت و شوێنێک، بەڵکو ئەوەی واتلێدەکات لەنێوان هەردوو چینەکەدا بەدڵخۆشییەوە بژی دڵێکی کراوەیە.

کەمێک وەستا و سەیرێکی کردم: من دەمرم، وایە یان نا؟

- وایە

«ئەی باشە بۆ ئەوەندە بەلامەوە گرنگە گوێ بگرم لە کێشەی خەڵکیتر؟ خۆم ئازار و خەفەتم کەمن؟ بێگومان خۆشم ئازارم هەیە و کەمیش نین، بەڵام بەخشین بە بەرامبەرەکەم واملێدەکات هەست بە زیندوویێتی خۆم بکەم. سەیارەکەم و خانووەکەم ئەو هەستەم پێنابەخشن، ڕوخسار و جوانییم ئەو هەستەم پێنابەخشن. کاتێک کاتی خۆم دەبەخشم بەخەڵک، کاتێک دەتوانم کەسێکی خەمبار دڵخۆش بکەم و بیهێنمە زەردەخەنە، ئەوەندە هەست بە تەندروست بوونی خۆم دەکەم، کە دەڵێی هەر نەخۆشیش نیم.

میچ، ئەو کارانە بکە، کە لەناخی دڵتەوە دێنە دەرەوە. ئەگەر ئەوەت کرد ئەنجامەکان دڵخۆشت دەکەن، خەمبار نابی. ئیرەیی بەکەس نابەی، شێت نابی بۆ بەدەستهێنانی ئەوەی خەڵکیتر بەدەستیانهێناوە. بەپێچەوانەوە، ئەوەی لەبەرامبەر ئەو بەخشینەتدا وەریدەگریتەوە زۆر سەرسامت دەکات.

یەک دوو جار کۆکی و دەستی درێژکرد بۆ زەنگەکە، کە لەسەر کورسییەکەی تەنیشتی دانرابوو. چەند جارێک دەستی بۆ برد و بۆی هەڵنەگیرا، زەنگەکەم هەڵگرت و خستمە مستییەوە.

بەچپە سوپاسێکی کردم، ئینجا بەدەستە لاوازەکانی زەنگەکەی لێدا بۆئەوەی کۆنیی بێت بەدەنگییەوە.

لێی پرسیم: باشە میچ، ئەو (تێد تێرنەر)ەی باست کرد، قسەیەکی باشتری نەدۆزیبۆوە لەسەر کێلی قەبرەکەی بۆی بنووسن؟

هەمـوو شـەوێك، كـە دەخـەوم دەمـرم. بەیانـی كـە هەڵدەسـتم، لەدایك بوومەتەوە.

مەهاتما گاندی

## سێشەممەی نۆیەم
## باسی چۆنیەتی بەردەوامبوونی خۆشەویستیی دەکەین

گەڵاکان خەریکبوو ڕەنگیان دەگۆڕا و شەقامەکانی (وێست نیو تاون)یان ئاڵتونیی کردبوو. گەشتمەوە دیترۆیت. کێشە و مانگرتنەکان چەقیان بەستبوو لەبەرئەوەی هەردوولا یەکتریان بەوە تاوانباردەکرد، کە بەجددی نەهاتوونەتە پێشەوە بۆ چارەسەری ڕیشەیی کێشەکان. هەواڵەکانی تەلەفیزیۆنیش زۆر ناخۆش بوون. لەگوندێکی ویلایەتی کنتاکی سێ پیاو کێلی قەبرێکیان شکاندبوو، دوای ئەوەش لەپردێکەوە پارچەی کێلەکەیان هەڵدابووە خوارەوە و زیانی زۆریان لەسەیارەیەک دابوو سەرەڕای ئەوەش کچێکی هەرزەکار کەلەسەیارەکەدا لەگەڵ خێزانەکەیدا بۆ بۆنەیەکی ئاینی دەچوو بەهۆی هەمان ڕووداوەوە گیانی لەدەستدابوو. لە (ویلایەتی کالیفۆرنیا)ش دادگاییکردنەکەی ئۆ جەی سمپسۆن بەرەو کۆتایی دەڕۆیشت. وڵات بەبەردەوامی خەو و خۆراکیان ببوو بەو دادگاییە. تەنانەت لە فرۆکەخانەکانیشدا تەلەفیزیۆنێکی شاشە گەورە لەسەر کەناڵی سی ئێن ئێن دانرابوو بۆ ئەوەی خەڵک بەدەم چاوەڕوانکردنەوە ئاگایان لەدادگاییەکە بێت.

چەند جارێک هەوڵمدا پەیوەندی بەو برایەمەوە بکەم، کە لە ئیسپانیا بوو. نامەی دەنگیم بۆ بەجێهێشت و لەهەموویاندا پێمگوت، کە بەڕاستی دەمەوێت قسەی لەگەڵ بکەم و زۆر بیر لەخۆمان

و برایەتیی نێوانمان دەکەمەوە، بەڵام ئەو دوای چەند هەفتەیەک نامەیەکی کورتی بۆ ناردم، کە تیایدا گوتبووی هەموو شتێک باشە، بەڵام هیچ شتێکی لەسەر نەخۆشییەکەی نەگوتبوو.

بۆ مۆریی باسکردنی نەخۆشییەکەی و تەنانەت دانانی بە کوشندەیی نەخۆشییەکەشیدا زۆر ئاسایی بوو. کێشەی ڕاستەقینەی مۆریی خوودی نەخۆشییەکە بوو، کە خەریکبوو دەگەیشتە قۆناغی کۆتایی.

دوای کۆتا سەردانم بۆ لای، سستەرێک هاتبوو بۆ سەردانی و سۆندەیەکی خستبووە کونی میزییەوە. ئەو سۆندەیە لەمیزڵدانییەوە میزی دەهێنایە دەرەوە و دەیبردە ناو عەلاگەیەک، کە لەسەر زەویەکە لەتەنیشت کورسیەکەیەوە دانرابوو. هەرچەندە مۆریی نەیدەتوانی قاچەکانی بجوڵێنێت، بەڵام قاچەکانی ئازاریان دەدا و دەبوو یەکێک زوو زوو چاودێریان بکات. ئەوەش یەکێکیتر بوو لە زەبرەکانی (ئەی ئێڵ ئێس). ئەگەر بەشێوەیەکی ڕاست قاچەکانی لەسەر بەشی پێشەوەی عەرەبانەکە دانەنایە، ئەوەندەی ئازار پێدەگەیشت دەتگوت چەتاڵ دەکەن بە قاچیدا. هەندێکجار لەناوەڕاستی قسەکردندا داوای لە میوانەکانی دەکرد کەمێک قاچی بۆ بەرز بکەنەوە، یان کەمێک سەری لەسەر سەرینەکە بجوڵێنن. بیهێنەرە بەرچاوی خۆت وات لێبێت نەتوانیت سەری خۆشت بجوڵێنیت!

لەگەڵ هەر سەردانێکمدا تێبینم دەکرد مۆریی لەناو کورسییەکەیدا بچووکتر دەبۆوە و بڕبڕەی پشتی زیاتر دەردەپەڕی، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو بەیانییەک سوور بوو لەسەر ئەوەی لەجێگاکەیەوە هەڵیبگرن و بەعەرەبانەکەی ببیەن بۆ ژوورەکەی خۆی بۆئەوەی نزیک بێت لە کتێبەکانی و لەڕۆژنامەکان و لە گوڵەکانی سەر تاقی پەنجەرەکە. مۆریی شتێکی فەلسەفیی لەمەدا دەبینی.

پێیگوتم: ئێستا لەتازەترین وتەمدا ئەمانەت بۆ کورت دەکەمەوە.
- ئادەی با گوێم لێی بێ.
- کە لە جێگادا کەوتی، مردووی.
زەردەخەنەیەکی کرد. تەنها مۆریی بوو دەیتوانی لەساتێکی ئاوادا زەردەخە بکات.
لەزۆرێک لەو کەسانەوە، کە بەرنامەی (نایت لاین)یان ئامادە دەکرد، تەنانەت لەلایەن تێد کۆپێڵ خۆشییەوە پەیوەندی بە مۆرییەوە کرابوو بۆ ئەوەی بەرنامەیەکی تری لەگەڵدا ساز بکرێت.
- میچ، دەزانی دەیانەوێ بێن و جارێکی تریش چاوپێکەوتنم لەگەڵ بکەن. بەڵام دەڵێن جارێ نا، ماوەیەکی تر.
- کەی بەنیازن بێن؟ نازانن تۆ نەخۆشی!
- ڕاست دەکەی، ئەوەندەم نەماوە.
- شتی وا مەڵێ.
- باشە میچ گیان، ببورە.
- بەڕاستی زۆر پەست دەبم بەوەی دەیانەوێ چاوەڕێبکەن تا تەواو پەکت دەکەوێ ئینجا بێن و چاوپێکەوتنەکەت لەگەڵ بکەن.
- میچ، ئەوە تۆ بۆیە پێی پەست دەبی، چونکە خۆشت دەوێم و ئاگات لێمە.
زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: مەبەستییانە بەکارم بهێنن و ڕەنگە بیانەوێ درامایەکم پێ دروست بکەن، بەس من گوێی نادەمێ. ئەوەتا منیش ئەوان بەکاردەهێنم. ئەی ئەوە نییە لەڕێگەی ئەوانەوە پەیامەکەم دەگەیەنمە ملیۆنان خەڵک. ئەگەر ئەوان نەبوونایە من ئەوەم لە کوێ پێدەکرا. کەواتە بابەتەکە دوولایەنەیە.
کۆکی و قورگی پاککردەوە، کە تەواو بوو گوتی: بەهەرحاڵ، پێمگوتوون باشترە زۆر چاوەڕێ نەکەن، چونکە ئیتر وردە وردە

دەنگەکەشم نامێنێ. (ئەی ئێل ئێس)ەکە بگاتە سییەکانم، ڕەنگە ئیتر بەهیچ شێوەیەک قسەم بۆ نەکرێ. تەنانەت ئێستاش ئەگەر زوو زوو پشوو وەرنەگرم، ناتوانم زۆر قسە بکەم هەر لەبەر ئەوەشە سەردانی چەندین کەسم هەڵوەشاندۆتەوە، کە ویستوویانە بێن بۆ لام. میچ، میوانەکانم زۆر زۆرن و منیش زۆر لاواز و بێهێزم، ئەگەر بێن و نەتوانم بەتەواوی لەگەڵیان بم و هەموو بیری خۆمیان بدەمێ، کەواتە نەمتوانیووە یارمەتییان بدەم.

سەیرێکی تۆمارکەرەکەم کرد. هەستم بە تاوانباریی کرد، چونکە وەک یەکێک خۆم هاتەبەرچاو، کە ئەو کاتە کەمە دەدزێت، کە مۆریی بۆ قسەکردن مابووی.

لێم پرسی: هیلاکیت؟ وازی لێبهێنین؟

مۆریی چاوەکانی داخست و سەرێکی لەقاند، وادیاربوو چاوەڕێی ئازارێک بکات بێت و بڕوات. دواجار گوتی: نا لایمەبە. من و تۆ دەبێ پێکەوە بەردەوام بین. ئەمە کۆتا توێژینەوەمانە بەیەکەوە.

- ڕاست دەکەی، کۆتا توێژینەوەیە.

- دەبێ بەباشیش بینووسین!

بیرم لەیەکەم توێژینەوەم کردەوە، کە لەزانکۆ بەسەرپەرشتی مۆریی نووسیم. بێگومان ئەو کارەشمان پێکەوە هەر بیرۆکەی ئەو بوو. ئەو بوو هانیدام توێژینەوەیەکی وا بنووسم. لەڕاستیدا من خۆم هەرگیز بیرم لە شتێکی وا نەکردبۆوە.

ئێستاش پێکەوە گەیشتووینەتە ئێرە و هەمان ئەو شتە دەکەینەوە، کە چەندین ساڵ لەوەو پێش پێکەوە کردمان. ئەمجارەیان لەبیرۆکەیەکەوە دەستمان پێکرد: پیرەمێردێک لەسەر لێواری گۆڕەکەیەتی، پێش ئەوەی بمرێت قسە لەگەڵ پیاوێکی گەنجی لەشساغ دەکات و ئەوەی پێدەڵێت، کە دەبێت بیزانێت.

دەبێت ئەوەش بڵێم، کە لەپرۆژەی ئەمجارەمدا لەگەڵ مۆریی وەک جاری پێشوو پەلەی تەواو بوونم نەبوو!

لەسەر دیوارەکەی پشت منەوە پارچە کاغەزێکی گەورە هەڵواسرابوو، کە دیاریی هاورێکانی مۆریی بوو بۆ مۆریی و لە ئاهەنگی حەفتا ساڵەی یادی لەدایکبوونیدا بۆیان هێنابوو. لەسەر کاغەزەکە هەموویان پەیامی تایبەتی خۆیان بۆ مۆریی نووسیبوو. هەر نووسینێک لە نووسینەکانی ئەو هاورێیانە پەیامێکی جیاوازی هەبوو. دانەیەک نووسیبووی: مۆریی باشترین شت چاوەڕێی تۆیە. یەکێکیتر نووسیبووی: مۆریی تۆ باشترین مامۆستایت بۆ چارەسەرکردنی کێشە دەروونییەکان.

مۆریی لەسەر شانی منەوە سەیرێکی ئەو پارچە کاغەزانەی کرد، کە هەموویان لەسەر فایلێکی گەورە جێگیرکرابوون، ئینجا گوتی: میچ، دوێنێ کەسێک پرسیارێکی جوانی لێکردم.

- چی بوو؟

- لێی پرسیم ئایا نیگەرانی ئەوەم دوای مردنم خەڵک بیریان بچمەوە.

- ئێ ئەی تۆ گوتت چی؟

- پێموانییە نیگەرانی شتێکی وا بم. زۆر کەس هەن، کە لەنزیکەوە و بەوپەڕی خۆشەویستیی و ڕاستگۆییەوە لەگەڵیاندا پەیوەندییم هەبووە. ئەوەی مرۆڤ بە زیندوویی دەهێڵێتەوە خۆشەویستییە، تەنانەت دوای مردنیش.

- قسەکەت لە شیعری گۆرانی و شتی وا دەچێ: ئەوەی مرۆڤ بە زیندوویی دەهێڵێتەوە خۆشەویستییە.

مۆریی بەقسەکەم پێکەنی: ڕاست دەکەی، بەڵام با پرسیارێکت لێبکەم: ئێمە دوای ئەوەی لێرە ئەو هەموو قسەیە دەکەین، کە

دەگەڕێیتەوە قەت ڕوودەدا گوێت لەدەنگی من بێ؟ مەبەستم ئەوەیە کاتێک بەتەنیای؟ بۆ نموونە ئەو کاتەی لەفڕۆکەکەدا دانیشتووی؟ یان لەسەیارەکەتدا؟

دانم پێدانا: بەڵێ.

- کەواتە دوای مردنیشم تۆ منت هەر بیر دەبێ. دەزانی چی؟ کە مردم بیر لەدەنگم بکەرەوە، ئیتر وەک ئەوە وایە هاتبمەوە بۆ لات.

- بیر لە دەنگت بکەمەوە؟

- ئەگەر گریانیشت هات، بگری، ئاساییە.

مۆریی لەو کاتەوەی لەقۆناغی یەکەمی زانکۆوە ناسیبووم دەیویست وام لێبکات بتوانم بگریم.

من لەم بیرکردنەوەیەدا بووم و گوتی: بەمزووانە لێت دەبمەوە.

وەڵامم دایەوە: ڕاست دەکەی.

***

- خۆم یەکلایی کردۆتەوە، کە دەمەوێ چی لەسەر کێلی گۆڕەکەم بنووسرێ.

- مۆریی گیان، باسی شتی وا مەکە.

- بۆ؟ بێتاقەت دەبی؟

شانێکم بەرز کردەوە.

- باشە باسی ناکەین.

- نا، پێمبڵێ. دەتەوێ چی بنووسرێ؟

- بیرم لەمە کردۆتەوە: «مامۆستایەک تا کۆتایی ژیانی مامۆستا»

کەمێک لەسەرم وەستا تا تێی بگەم.

دووبارەم کردەوە: مامۆستایەک تا کۆتایی ژیانی مامۆستا!

- باشە بەلاتەوە؟
- زۆریش باشە.

***

هەموو جارێک کە دەچووم بۆ لای مۆریی، هەر کە لەدەرگاوە دەردەکەوتم زەردەخەنەیەکی بۆ دەکردم و دڵم زۆر پێی خۆشدەبوو. دەمزانی مۆریی ئەو زەردەخەنەیە بۆ هەموو کەسێک دەکات، بەڵام زەردەخەنەکە بەشێوەیەک جوان و ڕاستگۆیانە بوو، کە هەر میوانێک هەستیدەکرد تەنها بۆ ئەوە.

مۆریی کە منی دەبینی چەندە بیتوانیایە دەنگی بەرز دەکردەوە و دەیگوت: ئۆوا هاوڕێکەم هات. ئەی بەخێر بێی.

مۆریی لەگەڵ میوانەکانیدا هەر بەو سڵاو و بەخێرهاتنە نەدەوەستا، کاتێک لەگەڵیشی دادەنیشتیت، بەتەواوی گرنگیی و کاتی خۆی دەدایتێ و بەڕاستی لەگەڵت دەبوو. ڕاستەوخۆ سەیری چاوی دەکردیت و بەشێوەیەک گوێی بۆ دەگرتیت دەتگوت لەسەر زەوی بەس تۆ هەیت. بیهێنەرە بەرچاوت ڕۆژانە خەڵک یەکەم یەکتربینینیان بەمشێوەیە بێت، شتەکانیتری نێوانیان چۆن دەبن و چەندە لەگەڵ یەک دەگونجێن؟ بەڵام زۆربەمان لەجیاتی شێوازێکی پەیوەندییکردنی لەمجۆرە، ڕۆژەکانمان بە بۆڵەبۆڵی شاگردێک، یان شۆفێری پاسێک، یان بەڕێوەبەرەکەمان دەست پێدەکەین.

مۆریی گوتی: من بڕوام وایە دەبێ مرۆڤ بەتەواوی لە «ئێستا»ی ژیانیدا بژی. مەبەستم ئەوەیە بۆ نموونە بەتەواوی لەگەڵ ئەو کەسە بی کە لەگەڵتە. میچ، ئێستا کە من قسە لەگەڵ تۆ دەکەم هەوڵدەدەم هەموو بیرم لای ئەو شتە بێ کە لەم ساتەدا لەنێوان من و تۆدا دەگوزەرێ. بیر لەشتێک ناکەمەوە، کە هەفتەی پێشوو

باسمان کردووە، بیر لەوەش ناکەمەوە هەینی چی ڕوودەدا. بیر لە دەرمانەکانم، یان لە چارپێکەوتنێکیتر لەگەڵ کۆپێل ناکەمەوە. من ئێستا قسە لەگەڵ «تۆ» دەکەم. بیر لە «تۆ» دەکەمەوە.

بیرم کەوتەوە چۆن کاتی خۆشی لە زانکۆی براندایس کاتێک گرووپی گفتوگۆمان دروستدەکرد، مۆریی هەوڵیدەدا هەمان ئەو شتەمان فێربکات. ئەو کاتە گاڵتەم بە بیرۆکەکە دەهات و دەمگوت بەڕاستی لەم بەشە گەورەیە ئەمە دەخوێنن؟ فێرمان دەکەن چۆن گرنگیی بە شتەکان و بە کەسەکان بدەین؟ بەڵام ئێستا دەزانم ئەو بیرۆکە و ستراتیژە لەڕاستیدا گرنگترە لە زۆربەی هەرە زۆری ئەو شتانەیتر، کە لە ژیانی زانکۆمدا فێریان بووم.

مۆریی دەستی بۆ ڕاکێشام و منیش دەستم خستە دەستییەوە. لەناوەوە هەستم بەتاوانباریی دەکرد. لەبەردەمی پیاوێکدا بووم، کە دەکرا هەموو بەیانییەک دوای لەخەوهەستان کاتێکی زۆر بە بەزەیی بەخۆداهاتنەوەوە بەسەر ببات، خەفەت بۆ جەستە لاوازەکەی بخوات و هەناسەکانی بژمێرێت، بەڵام لەجیاتی ئەوە بەوشێوەیە دەژیا، کە دەژیا. لەملاشەوە زۆر کەسم دەناسی بەدەست کێشەی زۆر بچووکەوە دەیاننالاند و ئەگەر بۆ کەمتر لە خولەکێک قسەت لەگەڵ بکردنایە لەبارەی کێشەکانیانەوە یەکسەر چاویان پڕ دەبوو لە ئاو. زۆربەی خەڵک کاتێک قسەیان بۆ دەکەیت هەر لەبنەڕەتدا گوێت لێناگرن و لەمێشکیاندا چەندین شتیتر دەگوزەرێن: تەلەفۆنکردن، فاکس ناردن، یان بیریان لای خۆشەویستەکەیانە.

ئەو کەسانەی بەو نائامادەییەوە لەگەڵتدان، کاتێک بیریان دەکەوێتەوە گوێت بۆ بگرن و گرنگیی بەقسەکانت بدەن، تۆ قسەکانی خۆتت تەواو کردووە، ئینجا دەڵێن: وایە، وایە، ڕاستە. یان: بەڵێ قسەی جەنابتە. بەمشێوەیە دەیانەوێت وانیشان بدەن،

کە هەر لەسەرەتاوە ئاگایان لێت بووە.

مۆریی گوتی: دەزانی میچ، بەشێک لە کێشەکە ئەوەیە هەموومان زۆر پەلەمانە. مانا و مەبەستمان لەژیانیانماندا نەدۆزیوەتەوە لەبەرئەوە بەردەوام ڕادەکەین بەو هیوایەی بیاندۆزینەوە. پێمانوایە سەیارەی دواتر، خانوویەکیتر، ئیشێکی باشتر ئەو مانا و مەبەستەمان پێدەبەخشێ. بەڵام دواجاریش کاتێک ئەو شتانە بەدەست دەهێنین، سەیر دەکەین بەتاڵن و هیچیان تێدا نییە لەبەرئەوە بەردەوام دەبین لە ڕاکردن.

- بەڵام مۆریی گیان، کێشەکە ئەوەیە هەر دەستت کرد بەڕاکردن، ئیتر قورسە بتوانی هێواشی بکەیتەوە.

وەڵامی داوەمەوە: زۆریش قورس نییە. دەزانی من چی دەکەم بۆ ئەوە؟ کاتێک یەکێک لە ترافیکدا دەیەوێ پێشم کەوێ، باسی ئەو کاتەت بۆ دەکەم، کە دەمتوانی سەیارە لێبخوڕم، دەستێکی بۆ بەرزدەکەمەوە...

هەوڵیدا بەوشێوەیەی دەیگوت دەستی بەرز بکاتەوە بەڵام نەیتوانی، هەمووی شەش ئینجێک دەستی بۆ بەرزکرایەوە.

- ...دەستێکی بۆ بەرزدەکەمەوە وەک ئەوەی بمەوێ شتێکی ناشیرینی پێبڵێم، بەڵام لەجیاتی ئەوە سڵاوێکی لێدەکەم و زەردەخەنەیەکیشی بۆ دەکەم.

- مەبەستت ئەوەیە لەجیاتی ئەوەی جنێویان پێبدەی، سڵاویان لێدەکەی و بۆشیان پێدەکەنی؟!

- ڕەنگە پێت سەیربێ، بەڵام زۆربەی جار بۆم پێدەکەننەوە! باشە چ پێویست دەکات من ئەوەندە پەلە لەسەیارەکەم بکەم. لەجیاتی ئەوە دێم ئەو وزەیە لەخەڵکدا دەخەمەگەڕ.

مۆریی لەهەموو ئەو کەسانەی ناسیبوومن باشتر ئەمەی دەکرد.

ئەوانەی لەگەڵی دادەنیشتن گەواهیدەری ئەوە بوون، کە مۆریی چۆن چاوەکانی پڕ دەبوون لە فرمێسک کاتێک کەسێک چیرۆکێکی ناخۆشی ژیانی خۆی بۆ دەگێڕایەوە، یان چۆن بەقووڵی پێدەکەنی کاتێک کەسێک نوکتەیەکی بۆ دەکرد، تەنانەت ئەگەر نوکتەکە خۆشیش نەبووایە. مۆریی هەمیشە ئامادەبوو هەستەکانی خۆی دەربخات، ئەمە ئەو شتە بوو، کە نەوەی سەردەمی من زۆر خراپ بوون تیایدا.

ئێمە هەر لە باسە سواو و مەسەلە بچووکەکاندا قسە دەکەین: ئەرێ ئێستا بە چییەوە خەریکی؟ لەکوێ دەژی؟ و ئەم پرسیارانە، بەڵام ئەوەی گرنگە لەخۆمانی بپرسین ئەوەیە تا چەندە لەدڵەوە و بەئامادەییەکی تەواوەوە گوێ لەوکەسانە دەگرین، کە بەرژەوەندیمان لەگەڵیاندا نییە، یان نامانەوێت لە ڕێگەی ئەوانەوە بگەین بە شتێک، یان شتێکیان پێ بفرۆشین؟

لەوبڕوایەدام زۆربەی ئەو کەسانەی لەو چەند مانگەی ڕابردوودا سەردانی مامۆستا کۆنەکەمیان کردووە هۆگری مۆریی بوون بەهۆی ئەو گرنگییە زۆرەی مۆریی بە ئەوانی دەدا، نەک ئەو گرنگییەی ئەوان دەیانویست بە مۆریی بدەن. سەرەڕای ئەو نەخۆشی و ئازارانەش، ئەم پیاوە پیرە بچووکە بەشێوەیەک گوێی بۆ دەگرتیت، کە ئاوات بخوازیت کەسێکیتریش هەبووایە ئاوا گوێت بۆ بگرێت.

پێمگوت کە هەموو کەس حەزیاندەکرد ئەو باوکیان بێت.

بەچاوی داخراوەوە وەڵامی دامەوە: لەو لایەنەشەوە ئەزموونی خۆمم هەیە...



دوا بینینی مۆریی و باوکی ئەو ڕۆژە ڕوویدا، کە مۆریی چوو بۆ

بەشی پزیشکی دادوەریی. چارلی شوارتز پیاوێکی هێمن و لەسەرخۆ بوو. حەزیدەکرد بەتەنیا لەژێر گڵۆپەکانی شەقامی (تریمۆنت)دا لە برۆنۆکس دابنیشێت و ڕۆژنامە بخوێنێتەوە. ئەو کاتەی مۆریی منداڵ بوو، چارلی هەموو شەوێک دوای نانی ئێوارە پیاسەیەکی دوورودرێژی ماڵی خۆیانی دەکرد.

چارلی پیاوێکی بچکۆلەی ڕووس بوو، دەموچاوێکی سووری و قژێکی ماشوبرنجیی هەبوو. کاتێک مۆریی و براکەی سەیریان دەکرد چۆن باوکیان لەژێر گڵۆپەکاندا بەسەعات دادەنیشێت، پڕ بەدڵ حەزیان دەکرد بێتەوە ژوورەوە و قسەیان لەگەڵ بکات، بەڵام ئەوە زۆر کەم ڕوویدەدا.

چارلی منداڵەکانی نەدەبردە ناو جێگا و شەوانەش پێش خەوتن ماچی نەدەکردن. ئەمە وای لەمۆریی کرد چەند جارێک سوێند بخوات، کە ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان خۆی منداڵی هەبوو، وا نەبێت لەگەڵیان. دواتر مۆریی کە گەورە بوو، ژنی هێنا و منداڵیشی بوو، ئەو شتەشی کرد، کە سوێندی لەسەر خواردبوو!

لەکاتێکدا مۆریی خەریکی بەخێوکردن و گەورەکردنی منداڵەکانی بوو، چارلی هێشتا هەر لە برونۆکس دەژیا. هێشتا پیاسەکانی جارانی هەر مابوون، هێشتا وەک جاران هەر خەریکی ڕۆژنامە خوێندنەوە بوو. شەوێکیان دوای خواردنی نانی ئێوارە ڕۆیشتە دەرەوە و چەند گەڕەکێک لەماڵی خۆیان دوورکەوتەوە، پاش کەمێک دوو دز پەلاماریاندا. یەکێک لە دزەکان دەمانچەی لێدەرهێنا و هاواری بەسەردا کرد: هەر ئێستا چیت پێیە داینێ.

چارلیش بەترسێکی زۆرەوە جزدانەکەی بۆ خستنە سەر زەوییەکە و بەناو کۆڵانەکاندا ڕایکرد. بەردەوامبوو لە ڕاکردن تا گەیشتە ماڵی یەکێک لە خزمەکانی. لەبەردەگای ماڵیان کەوت. هەرلەوێدا جەڵتە

لێیدا و مرد. دواتر مۆریی بانگکرا بۆ بەشی پزیشکی دادوەریی بۆ ناسینەوەی تەرمەکە. بەپەلە بەفڕۆکە خۆی گەیاندە نیویۆرک و ڕاستەوخۆ چوو بۆ (بەشی تەرمەکان) لەناو بینای پزیشکی دادوەریی. کارمەندێک مۆریی برد بۆ ژێرزەمینێکی سارد. لەوێ کارمەندەکە دەستی بۆ تەرمێک درێژکرد و لەمۆریی پرسی: ئەوە باوکتە؟

مۆریی سەیرێکی تەرمەکەی کرد، کە لەناو شوشەیەکدا دانرابوو. تەرمی ئەو پیاوە بوو، کە چەندین ساڵ سەرزەنشتی مۆریی کردبوو. مۆریی گەورە کردبوو، فێری ئیشی کردبوو، تەرمی ئەو پیاوە بوو، کە ئەو کاتانەی مۆریی دەیویست قسە بکات، بێدەنگ بوو، تەرمی ئەو پیاوەی بە مۆریی گوتبوو دەبێت باسی دایکی و یادگارییەکانی دایکی نەکات لەکاتێکدا مۆریی دەیویست ئەو یادگارییانە بۆ تەواوی چواردەورەکەی باس بکات.

مۆریی سەرێکی لەقاند و ڕۆیشت. دواتر دانی پێدانا، کە ئەو ڕۆژە سامناکیی ژووری تەرمەکان هەموو ئەندامەکانی جەستەی لەکارخستووە بەشێوەیەک تادوای چەند ڕۆژێک لە مردنی باوکی، بەهیچ شێوەیەک نەیتوانیووە بگری.

مردنی چارلی، مۆریی ئامادەکرد بۆ مردنی خۆی. ئەو مردنە بڕیاری ئەوەی بە (مۆریی)دا، کە ژیانی پڕبکات لە باوەش و ماچ و گفتوگۆ و پێکەنین، لەسەرو هەموو ئەوانەشەوە بڕیاری ئەوەی پێدا، کە هیچ کەسێک بەبێ ماڵئاواییکردن بەجێنەهێڵێت. بەمانایەکیتر مۆریی دەیویست خۆی هەموو ئەو شتانە ببەخشێت، کە لەدایک و باوکییەوە پێینەبەخشرابوون.

کاتێک مردنی خۆی نزیک بۆوە، مۆریی زۆر مەبەستی بوو هەموو دۆست و ئازیزەکانی لەنزیکییەوە بن و ئاگایان لە ماڵئاوایکردنەکەی

بێت بۆئەوەی دواتر کەس تەلەفۆنی بۆ نەکرێت و ناچاربکرێت بچێت بۆ ژێرزەمینێکی سامناک بۆ ناسینەوەی تەرمێک.



لەناو دارستانەکانی ئەمەریکای باشووردا خێڵێک هەن پێیاندەگوترێت (دێسانا). ئەم خێڵە بڕوایان وایە، کە لەدونیادا ڕێژەیەکی نەگۆڕ لە وزە هەیە و لەنێوان بوونەوەرەکاندا بەردەوام دێت و دەچێت، بۆیە پێیانوایە هەموو لەدایکبوونێک دەبێتە هۆی مردنێکیش و هەموو مردنێکیش لەدایکبوونێکیتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت. بەمشێوەیە وزە و زیندوێتی دونیا بەپڕی دەمێنێتەوە. ئەندامانی ئەو خێڵە بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانیان ئاژەڵی جۆراوجۆر ڕاو دەکەن، بەڵام پێیانوایە هەر ئاژەڵێک، کە ڕاوی دەکەن بۆشاییەک لەدونیای ڕۆحەکاندا بەجێدەهێڵێت و ئەو بۆشاییەش دواجار بەڕۆحی ئەو ڕاوچییانەی خێڵەکەیان پڕ دەبنەوە، کە ئاژەڵەکانیان ڕاوکردووە. ئەو خێڵە دەڵێن ئەگەر مرۆڤ نەمرێت ئەوا چۆلەکە و ماسییتر دروست نابن. ئەم بۆچوونەم بەدڵە، مۆرییش بەدڵیەتی.

مۆریی هەتا زیاتر نزیک دەبێتەوە لە ماڵئاواییکردن، ئەو بڕوایە لە مێشکیدا پتەوتر دەبێت، کە دەڵێت مرۆڤەکان هەموویان زیندەوەری ناو یەک دارستانن. ئەوەی وەریدەگرن، دەبێت بیدەنەوە.

ـ شتێکی دادپەروەرانەیە.

مۆریی وا دەڵێت.

## سێشەممەی دەیەم
# باسی هاوسەرگیریی دەکەین

سێشــەممەی ئایــندە هاتمــەوە بــۆ لای مۆریــی و ئەمجارەیــان میوانێکیشــم لەگــەڵ خــۆم هێنــا: هاوســەرەکەم.

مۆری هــەر لەیەکــەم ســەردانمەوە لێــی دەپرسیم: ئــەرێ تــۆ کــەی (جانییــن) دەهێنیــت ببینــم؟ منیــش بــەردەوام پاســاوم دەهێنایــەوە و ئــەو یەکتربینینــەم دوادەخســت. دواجــار دوو، ســێ ڕۆژ پێــش ســەردانەکەم، پەیوەندییــم بــە مۆرییــەوە کــرد و زانیــم حاڵــی خراپــە، ئیتــر تێگەیشــتم لــەوەی نابێــت لــەوە زیاتــر یەکتــر بینینــی مۆریــی و جانییــن دوابخــەم.

کاتێــک پەیوەندییەکــەم کــرد، ســەرەتا ماوەیەکــی ویســت تــا مۆریی گەیشــتە لای تەلەفۆنەکــە، دواتریــش بەقســەکردن لەگەڵیــدا زانیــم کەســێکیتر تەلەفۆنەکــەی بــۆ گرتــووە. مۆریــی وایلێهاتبــوو چیتــر نەیدەتوانــی خــۆی دەســکی تەلەفۆنەکــە بگرێــت.

بەدەنگێکی نزم گوتی: چۆنی میچ؟

- تۆ چۆنی ڕاهێنەر؟

هەناسەیەکی قووڵی دایەوە: میچ، ئەمڕۆ ڕاهێنەرەکەت باش نییە.

بەرنامــەی خەوتنــی خەریکبــوو بەتــەواوی تێکدەچــوو. شــەوانە زۆربــەی کات دەبــوو ئۆکسجینەکە لەســەر دەم و لوتــی بێــت، دەبووایە

چەند دەنکە حەبێکیش بخوات بۆنەوەی کۆکەکەی هێور ببێتەوە جاری وا هەبوو کۆکەیەک دەیگرت سەعاتێکی دەخایاند کەس، تەنانەت خۆشی، نەیدەزانی دەوەستێتەوە، یان نا. مۆریس هەمیشە دەیگوت ئەوکاتەی نەخۆشییەکەی دەگاتە سییەکانی، دەمرێت نەخۆشییەکە تەواو سەرکەوتبوو، منیش کەبیرم دەکردەوە مردن چەندە لە مۆرییەوە نزیکە دەلەرزیم.

پێش ئەوەی تەلەفۆنەکە داخەینەوە پێمگوت: سێشەممە دەتبینم و پێکەوە ڕۆژێکی خۆش بەسەردەبەین.

- میچ؟
- بەڵێ
- ژنەکەت لێتەوە نزیکە؟
- بەڵێ، لەتەنیشتمەوەیە.
- تەلەفۆنەکەی بدەرێ، دەمەوێ گوێم لەدەنگی بێ.

من ژنێک هاوسەرمە، کە زۆر لەخۆم میهرەبانترە. جانیین هەرچەندە لەوەو پێش هەرگیز مۆریی نەبینیبوو، خێرا تەلەفۆنەکەی لێوەرگرتم و لەگەڵ مۆریی کەوتە قسە. ئەگەر من بوومایە لەجیاتی ئەو بەپەلە سەرم بادەدا و دەمگوت: پێی بڵێ لێرە نییە، پێی بڵێ لێرە نییە.

مۆریی و جانیین بەشێوەیەک لەگەڵ یەکتر قسەیان دەکرد دەتگوت چەند ساڵێکە یەکتری دەناسن، هەرچەندە هەموو ئەوەی گوێم لێیبوو لە «بەڵێ، ڕاست دەکەی، میچ پێیگوتم» یان «ئۆو! سوپاست دەکەم!» زیاتر نەبوو.

جانیین تەلەفۆنەکەی داخستەوە و گوتی: ئەمجارە کە چوویت بۆلای مۆریی منیش دێم.

ئیتر یەکتر بینینەکە ئاوا ڕێکەوت.

لەژوورەکەی دانیشتین و ئەمدیوو ئەودیومان لە مۆریی گرت مۆریی لەگەڵ ژناندا زۆر بە وریاییەوە مامەڵەی دەکرد. ئەگەر لەکاتی قسەکردندا پێویستی بەوە بووبایە بودستێنێت، یان بچێت بۆ سەرئاو، زۆر بەتایبەتی داوای یارمەتیی لە جانیین دەکرد و مۆڵەتی وەردەگرت.

جانیین کۆمەڵێک وێنەی زەماوەندەکەمانی لەگەڵ خۆی هێنابوو. بەدەم سەیرکردنی وێنەکانەوە مۆریی لە (جانین)ی پرسی: تۆش خەڵکی (دیترۆیت)ی؟

- بەڵێ.

- لە چلەکانی تەمەنمدا، بۆ ماوەی ساڵێک لە دیترۆیت مامۆستا بووم. چیرۆکێکی خۆشم بەسەر هات لەوێ.

وەستا و لووتی پاککردەوە، منیش دەستەسڕەکەیم بۆ گرت و بەهێواشی فنێکی پێداکرد، ئینجا بەدەوری هەردوو کونەلوتەکەیدا هێنا وەک چۆن دایک لوت بۆ منداڵەکەی دەسڕێت لوتیم سڕی. دەستەسڕەکەم فڕێدا و مۆریی کەوتەوە قسە: سوپاس میچ.

ئینجا سەیرێکی جانیی کرد و پێی گوت: ئەم (میچ)ە یاریدەدەری یەکەمی منە.

جانیی زەردەخەنەیەکی بۆ کرد.

- بەهەرحاڵ با چیرۆکەکەم بیر نەچێتەوە. لەو زانکۆیەی دەرسم لێدەگوتەوە کۆمەڵێک کۆمەڵناسم لەگەڵ بوون، بۆخۆمان زوو زوو کۆدەبووینەوە و یاری کۆنکەنمان لەگەڵ کارمەندەکانیتری بەشەکەمان دەکرد. لەناو ئەو کەسانەشدا پزیشکێکی نەشتەرگەری تێدابوو. شەوێکیان دوای ئەوەی کۆنکەنەکەمان تەواو کرد، داوای لێکردم رێگەی بدەم ڕۆژێک بێتە یەکێک لە وانەکانمەوە منیش زۆر بەسادەیی ڕازیبووم و دواتر کابرای پزیشک هات. دوای ئەوەی

وانەکەم تەواو بوو، پێیگوتم: زۆر سوپاست دەکەم، ئەوە من خۆم بینی لەکاتی نیشکردندا، ئەی تۆ دەتەوێ من ببینی لەکاتی نیشدا؟ ئەمشەو نەشتەرگەرییەک هەیە دەبێ بۆ نەخۆشێکی بکەم ئەگەر پێتخۆشە وەرە؟ ویستم منیش ئەو چاکەیەی لەگەڵ بکەمەوە لەبەر ئەوەی گوتم باشە دێم. هەر دوای وانەکەی خۆم، بردمی بۆ نەخۆشخانەکە و پێگوتم: ئێستا بچۆ دەستت بشۆ، ئینجا دەمامکێک ببەستە و ڕۆبێکیش لەبەربکە.

هەرئەوەندەم زانی خۆمم لەبەردەمی پزیشکەکەدا و لەتەنیشت مێزی نەشتەرگەریەکەوە بینییەوە. نەخۆشەکەیان لەسەر مێزەکە پاڵخستبوو. ژنێک بوو لە ناوقەدی بۆ خوارەوە ڕووت بوو. پزیشکەکە چەقۆیەکی هەڵگرت و زۆر بەسادەیی شوێنی نەشتەرگەرییەکەی هەڵدڕی. کە ئەو هەموو خوێنەم بینی تەواو تێکچووم. خێرا گوتم: خەریکە دەبوورێمەوە. بمبەنە دەرەوە.

سستەرێک لەتەنیشتمەوە بوو پێیگوتم: چیتە جەنابی دکتۆر؟

منیش گوتم: دکتۆری چی و تەڕەماشی چی، من دکتۆر نیم، خێرا بمبەنە دەرەوە.

لەگەڵ جانییەن زۆر پێکەنین، مۆریی بۆ خۆشی هەناسەکانی چەند ڕێگەیاندا پێکەنی. چەند هەفتەیەک بوو مۆرییم نەدیبوو بتوانێت بەشێوەکی وا قسەبکات و چیرۆک بگێڕێتەوە. بەلامەوە زۆر سەیر بوو، کە ئەو مۆرییەی ڕۆژێک لەڕۆژان بەبینینی کەمێک خوێن خەریکبووە ببورێتەوە، ئێستا بەوشێوە سادەیە مامەڵەی لەگەڵ نەخۆشییە کوشندەکەی خۆیدا دەکرد و بەرگەی ئەو هەموو ئازارانەی دەگرت.

کۆنیی لەدەرگایدا و پێی گوتین کە نانی نیوەڕۆ ئامادەیە. کۆنیی هیچ شتێکی لەو شتانە لێنەنابوو، یان دانەنابوو، کە ئەو ڕۆژە لە

دوکانی (برێد ئاند سێرکس) هێنابوومن. هەرچەندە هەموو جارێک کە شتم بۆ مۆریی دەکڕی هەوڵمدەدا نەرمترین و سوکترین خواردن هەڵبژێرم، بەڵام ئەو خواردنانەش هێشتا بایی ئەوەندە ڕەق بوون، کە مۆریی نەتوانێت بیانجووێت و قوتیان بدات. زۆربەی کات تەنها شلەمەنی دەخوارد، هەندێکجاریش پارچە سەمونێکی لە شلەکاندا دەتواندەوە و دەیخوارد. (شارلۆت)ی هاوسەری پێش ئەوەی هەر شتێکی بداتێ، بۆی دەخستە تێکەڵکەرەوەوە و جوان بۆی ورد دەکرد بۆ ئەوەی پێی هەرس بکرێت. وایلێهاتبوو خواردنی بە قەسەب دەخوارد، لەگەڵ ئەمانەشدا هەموو هەفتەیەک، کە دەچووم بۆلای لەجێگەیەک لامدەدا و دوو عەلاگەی پڕ شتم بۆ دەکڕی. ڕاستییەکەی ئەو شت کڕینە تەنها بۆ ئەوە بوو کەمێک دڵی خۆشبکەم و تەواو ئەگینا سەلاجەکەیان بەردەوام پڕبوو لە چەندین جۆر خواردن. هیوام دەخواست مۆریی چاک ببێتەوە و بگەڕێینەوە بۆ ئەو کاتەی پێکەوە نانمان دەخوارد و ئەویش بەدەم شت جوینەوە قسەی بۆ دەکردم، ئینجا خواردنەکە لە دەمی دەهاتەدەرەوە و پێدەکەنیم. دەزانم ئەوە هیوایەکی نەزانانە بوو.

مۆریی ڕوویکردە جانیین: ئێ جانیین، بۆ قسەیەک ناکەی؟

جانیین زەردەخەنەیەکی کرد.

- تۆ کچێکی زۆر جوان و خۆشەویستی، ئادەی دەستتم بدەرێ.

جانیین دەستی خستەناو دەستی مۆریی.

- میچ پێیگوتووم کە گۆرانیبێژێکی زۆر لێهاتووشیت، وایە؟

- ڕاستە.

- ئاخر ئەو دەڵێ هەر زۆر لێهاتووی.

جانیین پێکەنی و گوتی: نا، نا! بەڕاستی نازانم بڵێم چی. ئیتر ئەوە بڕوای (میچ)ە.

مۆریی بڕۆکانی بەرزکردەوە: ئەی گۆرانییەکم بۆ نالێی؟
من لەوەتەی جانیین دەناسم بەردەوام خەڵک داوای ئەوەی لێدەکەن گۆرانییان بۆ بڵێت. هۆکاری ئەم داواکردنەش ئەوەیە کاتێک خەڵک دەزانن، کە کاری تۆ گۆرانی گوتنە و لەسەر دەنگت دەژیت، خێرا پێت دەڵێن: ئادەی گۆرانییەکمان بۆ بڵێ. بەلام جانیین لەبەر ئەوەی شەرم لەبەهرەکەی خۆی دەکات و لەبارێکی زۆر گونجاودا نەبێت ئامادەنییە هیچ بڵێت، هەمیشە بەشێوەیەکی جوان ئەو داوایە ڕەتدەکاتەوە و تا ئێستا ئامادەنەبووە گۆرانی بۆ هیچ کەسێک بڵێت. کاتێکیش مۆریی ئەو داوایەی لێکرد، چاوەڕێی ئەوەم دەکرد وەک ئەوەی لەگەڵ خەڵکیتردا کردبووی، داواکەی (مۆریی)ش ڕەتبکاتەوە، بەلام هەر لەو ساتەدا، کە من بیرم لەوە دەکردەوە، جانیین بەدەنگە خۆشەکەی دەستیپێکرد:

کەبیر لەتۆ دەکەمەوە

بیرم دەچێتەوە
ئەو شتە بچووك و سادانە بکەم
کە هەموو کەسێك دەبێ بیانکات.

ئەوە یەکێک بوو لە گۆرانییە هەرە بەناوبانگەکانی ساڵانی سییەکان. هۆنراوەکەی هی (ڕەی نۆبڵ) بوو، (جانیین)یش زۆر بەجوانی گوتی و بەدرێژایی گۆرانییەکە ڕاستەوخۆ سەیری مۆریی کرد. سەرم سوڕما لەوەی کە مۆریی ئەمجارەش توانی هەستێک لە بەرامبەرەکەیدا بجوڵێنێت، کە ئەگەر ئەو نەبووایە بەرامبەرەکەی هەمیشە بە قفڵدراوی دەیهێشتەوە.
مۆریی بۆئەوەی بەتەواوی بچێتە ناو دێڕەکانەوە، چاوەکانی داخست. لەکاتێکدا دەنگە خۆشەکەی هاوسەرەکەم ژوورەکەی

پڕکردبوو، چاوم لێبوو زەردەخەنەیەک کەوتەسەر ڕووخساری مۆریی. هەرچەندە جەستەی ئەو بیاوە پیرە وەک فەردە لم ڕەق ببوو، کەسەیرم دەکرد بەڕوونی دەمبینی چۆن لەناو جەستەی خۆیدا سەما دەکات.

لەهەموو گوڵێکدا ڕووخسارت و
لە هەموو ئەستێرەکانی ئاسماندا
چاوەکانت دەبینم
تەنها بە بیرکردنەوە لە تۆ
تەنها بەبیرکردنەوە لە تۆ، خۆشەویستم!

کاتێک جانیین تەواو بوو، مۆریی چاوەکانی کردەوە و فرمێسک بەسەر ڕوومەتەکانیدا هاتنەخوارێ. هەستمکرد بەدرێژایی چەندین ساڵ و لە هەموو ئەو جارانەدا، کە جانیین گۆرانی گوتووە، من بۆ تەنها جارێکیش وەک مۆریی گوێم بۆ نەگرتووە.

٭٭٭

ژنهێنان: ئەو شتەی هەموو ئەوانەی دەمناسین بەشێوەیەک لەشێوەکان کێشەیان لەگەڵیدا هەبوو. هەندێک کێشەکەیان ئەوە بوو نەیاندەزانی چۆن و کەی بچنە ناو پرۆسەکەوە، هەندێک کێشەکەیان ئەوەبوو نەیاندەزانی چۆن و کەی لێی بێنە دەرەوە. دیاریبوو گەنجانی سەردەمی من کێشەیان هەبوو لەگەڵ خۆتەرخانکردن بۆ هاوسەر و ژنهێنانەکەیان، لەپابەندبوون دەترسان و وەک تیمساحێکی گەورەی ناو زۆنگێکی بچووک سەیریان دەکرد. من بۆ زۆر ئاهەنگی گواستنەوە دەچووم، پیرۆزباییم لە بووک و زاوا دەکرد و دوای چەند ساڵێک لە ڕێستورانتێک کاکی زاوام لەگەڵ کچێکی گەنجتر

ئەبینییەوە و پێی دەگوتم. ئەمە فلانی «هاوڕێ»مە. بێش ئەوەمە لە فلان جیابوومەوە.

پرسیارم لە مۆریی کرد لەسەر ئەم بابەتە: بۆچی لەم جۆرە کێشانەمان هەیە؟

من بۆ خۆم پێش ئەوەی بەڕەسمیی داوا لە جانیین بکەم شووم پێبکات حەوت ساڵ چاوەڕێمکرد. نازانم ئەو چاوەڕێکردنە، کە پیاوانی پێش ئێمە نەیاندەکرد، وریایی من بوو لە بڕیارداندا، یان خۆپەرستیی بوو؟

مۆریی گوتی: بەداخەوەم بۆ گەنجانی سەردەمی تۆ. لەم کولتوورەی ئێستاماندا دروستکردنی پەیوەندییەکی خۆشەویستیی تەندروست لەگەڵ کەسێکدا لەهەموو شتێک گرنگترە، چونکە خوودی کولتوورەکە ئەو خۆشەویستییەت ناداتێ، بەڵام کێشەکە ئەوەیە پیاوە داماوەکانی ئەم سەردەمە، یان ئەوەندە خۆپەرستن، کە ئامادەنین بچنەناو پەیوەندییەکی خۆشەویستیی بنیاتنەرەوە، یان ئەوەیە خێرا ژنێک دەهێنن و دوای شەش مانگ لێی جیادەبنەوە. خۆشیان نازانن دەیانەوێ هاوسەرەکەیان چۆن بێ و چ سیفاتێکی تێدابێ. ئەمەش پێمان دەڵێ کە ئەو پیاوانە لەبنەڕەتدا نازانن خۆیان کێن، کەوابێ چۆن دەزانن کێ بخوازن؟

ئاهێکی هەڵکێشا.

مۆریی بەدرێژایی تەمەنی کارکردنی وەک مامۆستای زانکۆ، ڕێنمایی و ئامۆژگاری چەندین خۆشەویست و ژن و مێردی کردبوو.

دەستی بەقسە کردەوە: بەداخەوەم کە نۆخەکە بەوشێوەیەیە. کەسانی خۆشەویست و هاوسەر زۆر زۆر گرنگن، کاتێکیش ئەولو هەست بەو گرنگییە دەکەی کە وەک من بکەویە بارێکی ئاولوە. هاوڕێ و برادەریش گرنگ و گەورەن، بەڵام ئەوانە کاتێک خەریکە

لە کۆکەدا دەخنکێم، کاتێک ناتوانم بخەوم و دەبێ بەدرێژایی شەوەکە یەکێک لەتەنیشتمەوە بێ و دڵم بداتەوە، هاورێکانم نین، کە دێن بۆ لام.

شارلۆت و مۆریی ئەوکاتەی خوێندکار بوون یەکتریان ناسیبوو. ئێستا ماوەی چل و چوار ساڵ بوو هاوسەری یەکتربوون. دەمبینی چەندە لەیەکتری نزیکن. شارلۆت بەردەوام بیری مۆریی دەهێنایەوە لەکاتی خۆیدا دەرمانەکانی بخوات، هەموو جارێکیش، کە دەهاتە ژوورەوە دەستێکی بە ملیدا دەهێنا و باسی یەکێک لە کورەکانیانی بۆ مۆریی دەکرد.

خێزانەکە هەموو پێکەوە وەکو تیمێک کاریان دەکرد، زۆرجار تەنها بەیەک سەیرکردنی خێرا و بەبێ هیچ بیرکردنەوەیەک لەمەبەستی یەکتر تێدەگەیشتن. شارلۆت بەپێچەوانەی (مۆریی)ەوە کەسێک بوو بابەتە شەخسییەکانی خۆی زۆر باسنەدەکرد، بەلام دەمزانی مۆریی چەندە رێز لەو شتە تایبەتەی شارلۆت دەگرێت، چونکە هەندێکجار، کە پێکەوە قسەمان دەکرد، پێی دەگوتم: میچ، دەترسم ئەگەر ئەمە بڵێم شارلۆت پێی ناخۆش بێ. وایدەگوت و گفتوگۆکەی لەسەر ئەو شتە کۆتایی پێدەهێنا. ئەوە تاکە سات بوو، کە تیایدا مۆریی شتێکی دەگەراندەوە و باسی نەدەکرد.

پاش کەمێک بێدەنگبوون گوتی: هاوسەرگیریی تاقیکردنەوەیەکە تیایدا مرۆڤ بۆی دەردەکەوێ خۆی کێیە، کەسی بەرامبەری کێیە، چۆن پێکەوە دەگونجێن و چۆنیش پێکەوە ناگونجێن.

- ئەی باشە مۆریی هیچ یاسایەک شتێک هەیە پێمان بڵێ فلانە هاوسەرگیری سەرکەوتوو دەبێ و فلان نابێ؟

مۆریی پێکەنی: شتەکان ئەوەندە سادە نین، میچ!

- راستە.

بەڵام هێشتا چەند یاسا و ڕێسایەک هەن لەسەر خۆشەویستیی و هاوسەرگیری و ڕاستیشن، بۆ نموونە ئەگەر ڕێزی کەسی بەرامبەر نەگری، دووچاری دونیایەک کێشە دەبی، ئەگەر نەزانی چۆن لەگەڵ بەرامبەرەکەت بگەیتە ڕێککەوتن لەسەر ئەو شتانەی ناکۆکن لەسەریان، دونیایەک کێشەیترت بۆ دروست دەبێ، ئەگەر نەتوانی بەڕوونی و ڕاشکاوی باسی ئەوە بکەی کە لەنێوانتاندا دەگوزەرێ، دیسان کێشەی زۆرت دێتەڕێ، هەروەها ئەگەر لیستێکیشت نەبێ بۆ شتە گرنگ و بەنرخەکانی ناو ژیانت، ئەوەش کێشەیترت بۆ زیاد دەکات. پێویستیشە لیستەکانتان وەک یەک وابن.

پشوویەکی بە سییەکانی دا و دەستیپێکردەوە: ئینجا دەزانی گرنگترین شتی ناو لیستەکە چییە، میچ؟

- چییە؟

- بڕوا و متمانەی ژن و مێرد بە گرنگیی هاوسەرگیرییەکەیان.

ئەمجارە بە لووتی هەناسەیەکی قایمی هەڵمژی و بۆ چەند ساتێک چاوی داخست. هەناسەکەی دایەوە و گوتی: من بەش بەحاڵی خۆم ئەنجامدانی ژنهێنان و شووکردن زۆر بەگرنگ و پێویست دەزانم و ئەگەر نەچیتە ناوی زۆرت لەدەستچووە. مۆریی بەدێرێکی ئەو هۆنراوەیە کۆتایی بەباسەکە هێنا کە وەک نوێژ و دوعا باوەڕی پێی هەبوو: یان یەکتریتان خۆش بوێت، یان بمرن.

***

بەمۆریی دەڵێم: زۆرباشە! بەڵام پرسیارێکم لێت هەیە.
بەپەنجە باریکە ئێسقاناوییەکانی عەینەکەکەی لەسەر سنگی گرتووە. عەینەکەکە لەگەڵ هەر هەناسەیەکیدا بەرز و نزمێک دەکات. ئینجا دەڵێت: چییە پرسیارەکەت؟
ـ بێگومان چیرۆکی ئەیوب پێغەمبەرت بیستووە.
ـ مەبەستت ئەوەیانە، کە لە ئینجیلدا باسکراوە؟
ـ بەڵێ. ئاشکرایە ئەیوب مرۆڤێکی بەهێز و باش بوو، بەڵام خوای گەورە توشی ئازار و ناڕەحەتی زۆری کرد بۆ ئەوەی باوەڕی تاقیبکاتەوە.
ـ وایە.
ـ هەرچی هەبوو لێی ستاندەوە: ماڵەکەی، خێزانەکەی...
ـ تەندروستییەکەشی.
ـ بەڵێ، وایە. نەخۆشیشی خست.
ـ بەڵام میچ ئەوە بۆ ئەوە بوو باوەڕی تاقیبکاتەوە.
ـ زۆر ڕاستە، بۆ ئەوە بوو، منیش مەبەستمە بزانم...
ـ چی بزانی؟
ـ مەبەستمە بزانم تۆ چۆن سەیری ئەو چیرۆکە دەکەی؟
ئەو پرسیارە دەکەم و مۆریی زۆر بەقورسی دەست دەکات بە کۆکە و لەگەڵ هەر کۆکەیەکیدا دەستەکانی دەلەرزن. پاش

ـەنگ هێور دەبیتـەوە و بەزەردەخەنەیەکـەوە دەڵێـت: پێموایـە
ـوا زۆری بـە نەیـوب کـرد.

# سێشەممەی یانزەیەم
## باسی کولتووری خۆمان دەکەین

- قایمتر لێیدە.

بەبەری دەستم بەقایمی دەکێشم بە پشی مۆریبدا

- قایمتر.

دووبارە لێی دەدەمەوە.

- بیدە لە نزیک شانەکانی... خوارتر.

مۆریی تەنها بیجامەیەکی لەبەردابوو، لەسەر لا لەسەر جێگاکەی پاڵکەوتبوو. سەری خستبووە سەر سەرینەکە و دەمیشی کردبۆوە چارەسەرکەرە سروشتییەکە فێری دەکردم چۆن بدەم بە پشتیدا بۆ ئەوەی کاریگەری ئەو ژەهرەی لە سییەکانیدا دروست بوو کەم ببێتەوە. دەبوو زوو زوو وا لە مۆریی بکەین بۆ ئەوەی ژەهرەکە بەرەو ڕەقبوون نەچێت و مۆریی هەناسەی بۆ بدرێت.

مۆریی بە نووزە نووز پێیگوتم: هەر دەمزانی دەتەوێ لێمبدەی

لەگەڵ دەستهێنان بە پێستە سپییەکەی پشتیدا، بەپێکەنینەوە وەڵامم دایەوە: ئەی چۆن، ها بگرە ئەمەیان هەقی ئەو نمرە کەمەیە لە قۆناغی دوو بۆت دانام.

هەموومان دەستمانکرد بە پێکەنین، پێکەنینێکی پڕ دڵنەوایی، کە تەنها کاتێک لەو کاتانەدا ڕوودەدات، کە ئیزرائیل لەو نزیکانەوە

دڵنیام ئەم دیمەنە زۆر جوان و خۆش دەبوو، بەڵام بەومەرجەی ڕاهێنانی پێش مردن نەبووایە.

نەخۆشییەکەی مۆریی تەواو پەرەی سەندبوو، بەشێوەیەک هیچی وای نەمابوو بگاتە سییەکانی. مۆریی بۆخۆی پێشتر گوتبووی بە خنکان دەمرێت، مردنێک، کە بەبڕوای من لەجۆرە هەرە ناخۆش و بەئازارەکانی مردنە. هەندێکجار کاتێک چاوی دادەخست و هەوڵیدەدا هەوا بهێنێتە ناو دەم و کونە لووتەکانییەوە، دەتگوت بەتەنیا بۆخۆی یەک کەشتی دەبەستێتەوە.

کەش و هەوای دەرەوە خەریکبوو ساردی دەکرد. سەرەتای مانگی ئۆکتۆبەر بوو. لەسەر جادە و بانەکانی نیوتۆن گەڵاوگۆڵ کەوتبوون. چارەسەرکەرە سروشتییەکە پێش من گەیشتبووە لای مۆریی. ڕاستییەکەی هەموو جارێک، کە دەچووم بۆلای مۆریی و سستەر و چارەسەرکەران دەهاتن بۆ ئەوەی ڕاهێنانی پێبکەن، من یارمەتیم وەردەگرت و دەچوومە دەرەوە، بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی هەفتەکاندا و کەمبوونەوەی کاتەکەمان پێکەوە، بەبێ ئەوەی خۆم پێی بزانم لەکاتێکدا خەڵکی تریشی لێبوو زیاتر لە مۆریی نزیک دەبوومەوە و کەمتریش هەستم بە شەرمەزاریی دەکرد. ئاخر منیش دەمویست لەوێ بم و ئاگام لە هەموو شتەکان بێت. لەڕاستیدا ئەو هەڵسوکەوتە لە من چاوەڕێنەدەکرا بەڵام هەر من نەبووم، زۆرینەی ئەو شتانەی لەچەند مانگی ڕابردوودا لەماڵی مۆریی ڕوویاندابوو چاوەڕواننەکراو بوون.

سەیری چارەسەرکەرەکەم دەکرد، کە خەریک بوو لەسەر جێگاکە ڕاهێنانی بە مۆریی دەکرد. دەستی دەخستەسەر پەراسووەکانی و هێواش هێواش دەیشێلان بۆئەوەی یارمەتیی سییەکانی بدات و شلەمەنی تیایاندا کۆنەبێتەوە. چارەسەرکەرەکە وەستا و داوای کرد

منیش کەمێک ئەو کارە بۆ مۆریی بکەم و منیش ڕازیبووم. مۆریی کە دەموچاوی خستبووە سەر سەرینەکە، زەردەخەنەیەکی کرد.

دەستم کێشا بە پشتی و لاکانیدا. چارەسەرکەرەکە چۆن دەیگوت وامدەکرد. هەرگیز پێمخۆش نەبوو مۆریی لەجێگادا ببینم، چونکە هەموو جارێک قسەکەی خۆیم بیردەکەوتەوە: کە لەجێگادا کەوتی، مردووی.

مۆریی لەسەر لا پاڵکەتبوو، جەستەی زۆر بچووک ببۆوە، زیاتر لە جەستەی هەرزەکارێکی دە، دوانزە ساڵان دەچوو. پێستی زەرد هەڵگەڕابوو، مووەکانی بڵاو و سپی بوون، دەستەکانیشی بەلاوازی پێوەی هەڵواسرابوون.

بیرم لەوە دەکردەوە، کە ئێمە چەندە کات تەرخان دەکەین بۆ ئەوەی جەستەمان بە ڕێکوپێکی بمێنێتەوە، یاری ئاسن دەکەین، چەندین جۆر ڕاهێنان دەکەین، لەکۆتاییشدا تەمەن هەموویمان لێدەستێنێتەوە. لەژێر پەنجەکانمەوە هەستم بە گۆشتی جەستەی مۆریی دەکرد، کە بەتەواوی شل ببۆوە. بەوشێوەیەی چارەسەرکەرەکە پێیدەگوتم بەقاییمی پەنجە گەورەم لەسەر هەندێ شوێنی جەستەی مۆریی دادەگرت. لەڕاستیدا لەجیاتی ئەوەی دەست بنێم بە پشتی مۆرییدا، لەخەفەتدا دەمویست بە بۆکس لەدیوارەکان بدەم.

بەقاییمی دەستم بەپشتیدا هێنایەوە و بەدەنگێکی نزم گوتی: میچ؟

- بەڵێ.

- من کەی نمرەی کەمم بۆ تۆ داناوە؟

***

مۆریی بڕوای وابوو، کە سیفاتە باشەکان بەشێوەیەکی خۆڕسک

لەهەموو مرۆڤێکدا چێنراون، بەڵام دەشێزانی مرۆڤ دەکرێت زۆر خراپ ببێت.

هەر ئەو ڕۆژە بوو، کە مۆریی قسەیەکی گرنگی پێگوتم: خەڵک تەنها کاتێک بەشێوەیەکی نەخوازراو مامەڵە دەکەن، کە لەژێر هەڕەشەدا بن. ئەم کولتوورەی ئێمەی هەڕەشەیە بۆسەر خەڵک! بەپلەی یەکەمیش ئابووریی هەڕەشەمان لێدەکات، تەنانەت ئەو کەسانەش کە خاوەنی کارن، هەر لەژێر هەڕەشەی ئابووریدان، چونکە دەترسن ڕۆژێک کارەکانیان لەدەستبدەن. مرۆڤ ئەگەر هەڕەشەی لەسەر بێ، تەنیا خەمی خۆی دەبێ، دەبێ بە پارەپەرست. ئەمە هەمووی پەیوەندی بە کولتوورەکەمانەوە هەیە.

هەناسەیەکی دایەوە: لەبەرئەوەیە من ئامادەنیم بچمە ژێر باری کولتوور.

سەرم لەقاند و دەستیم گوشی. ئێستا زوو زوو دەستی یەکتر دەگرین. بۆ من ئەمەش یەکێکیتر بوو لەگۆڕانکارییەکان. کۆمەڵێک شت هەبوون پێشتر شەرمم لەکردنیان دەکرد، بەڵام ئێستا زۆر بەئاسانی دەمکردن. بۆ نموونە عەلاگەی میزەکە لای قاچی منەوە بوو. ڕەنگە ئەوە چەند مانگێک لەوەو پێش بوایە زۆر بێزم لێیکردایەتەوە، بەڵام ئێستا زۆر ئاسایی بوو بەلامەوە. بەهەمانشێوە بۆنی ژوورەکەش زۆر ئاسایی ببوو لام، تەنانەت کاتێکیش دواوەی مۆرییان پاک دەکردەوە.

مۆریی چیتر نەیدەتوانی لەشوێنێکەوە بچێت بۆ شوێنێکیتر، نەیدەتوانی بچێتە سەرئاو و دەرگاکە دابخات و دوای ئەوەی تەواو دەبێت کەمێک بۆن برێژێت. هەموو ژیانی ببوو بە دانیشتن لەسەر کورسییەکەی و جێگاکەی. ئەگەر ژیانی من ئەوەندە بەرتەنگ ببولیەوە، گومانم هەیە بۆنی ژوورەکەم لە بۆنی ژوورەکەی ئەو

خۆشتر بووایە.

مۆریی گوتی: کە دەڵێم دەبێ کولتوورێکی بچووک بۆخۆت پێکەوەنێی مەبەستم ئەوە نییە، کە هەموو یاسا و ڕێساکانی کۆمەڵگاکەت پشتگوێ بخەی. بۆ نموونە من بە ڕووتی ناسوڕێمەوە، لە ترافیک لایتی سوور نادەم، پەیڕەوی هەموو ئەو شتە بچووکانە دەکەم، بەڵام شتە گەورەکان، مەبەستم چۆنیەتی بیرکردنەوە و ئەو شتانەی بەهایان هەیە لەلامان. ئەو شتانەی کە دەبێ خۆت هەڵیانبژێری، ناکرێ ڕێگە بدەی هیچ کەس، یان کۆمەڵگا لەجیاتی تۆ بڕیار لەسەر ئەو شتانەی ناو ژیانی تۆ بدات. بۆ نموونە سەیری حاڵی من بکە: ناتوانم بڕۆم، ناتوانم خۆم پاک بکەمەوە، هەندێک بەیانی دەگریم و چەند شتێکیتریش. کۆمەڵگا پێیوایە من دەبێ زۆر شەرم بکەم لەوەی ئەم کارانەم بۆ دەکرێ، یان ناکرێ، بەڵام لەڕاستیدا ئەو شتانە هیچی وایان تێدا نییە وا لەمرۆڤ بکات شەرم بکات. لای ژنانیش هەر وایە. بۆ نموونە ژنێک، کە دەبینێ کێشی زیادە، هەست بە شەرمی و کەمیی دەکات. یان پیاوێک، کە بیری دەکەوێتەوە وەک خەڵکی دەوڵەمەند نییە، شەرمەزار دەبێ. میچ گیان، ئەوە کولتوورەمانە دەیەوێ وامان لێبکات بەوشێوەیە لەشتەکان تێبگەین و بڕوایان پێبکەین، بەڵام دەزانی چی؟ تۆ بڕوایان پێمەکە.

پرسیارم لە مۆریی کرد، کە بۆچی لەگەنجیدا هەوڵینەداوە بچێتە شوێنێکیتر بژی.

- وەک کوێ، میچ؟

- نازانم، بۆ نموونە ئەمەریکای باشوور، یەکێک لە دوورگەکانی ئوستورالیا، ئیتر شوێنک وەک ئەمەریکا پڕ نەبێ لە خۆپەرستیی.

لەبەرئەوەی ئێستا بۆ وەڵامدانەوەی پرسیاری لەو جۆرە

نەیدەتوانی شانی بجولێنێت، تەنیا برۆکانی بەرزکردەوە: میچ، هەموو کۆمەڵگایەک کێشەی خۆی هەیە. چارەسەر ئەوە نییە لە کۆمەڵگاکە ڕاکەی، بەڵکو دەبێ کاربکەی بۆ دروستکردنی کولتوورێکی تایبەت بۆ خۆت. گرنگ نییە لە کوێ دەژی، گرنگ ئەوەیە کورتبین نەبی. دەزانی گەورەترین کەموکوڕیی ئێمەی مرۆڤ کورتبینیمانە. ناتوانین ئەوە ببینین، کە بەڕاستی دەتوانین ببین. ئێمە پێویستە سەیری تواناکانی خۆمان بکەین و هەوڵبدەین ببین بەهەر شتێک، کە دەکرێ ببین، بەڵام ئەگەر هەر چوار دەورت کەسی خۆپەرست و بەرژەوەندیخواز بێ، دواجار دەبینی کۆمەڵێک دەبنە خاوەنی هەموو شتێک و سوپایەک دروست دەکەن بۆئەوەی هەژارەکان بێدەنگ بکەن و ڕێگەیان نەدەن داوای هیچ شتێک بکەن.

مۆریی لەسەر شانمەوە سەیری لای پەنجەرەکەی دەکرد. جارجار گوێمان لەدەنگی با، یان سەیارەیەک دەبوو بەکۆڵانەکەدا تێدەپەڕی. بۆ چەند ساتێک لەپەنجەرەکەوە سەیری خانووی ماڵە دراوسێکانی کرد، ئینجا دەستی کردەوە بەقسە: میچ، کێشەکە ئەوەیە بڕواناکەین ئێمە و بەرامبەرەکەمان لەیەک دەچین. ڕەش پێست و سپی پێستەکان، کاسۆلیک و پرۆتستانتەکان، ژن و پیاو هەموو ئەو دەردەیان هەیە. ئەگەر بمانتوانیایە بەڕاستی ببینین، کە هەموومان وەک یەک واین، زۆر بەدڵخۆشییەوە یەک خێزانی گەورەی جوانمان لەسەر ئەم زەوییە دروست دەکرد و بەو شێوەیەی گرنگی بەخێزانی ڕاستەقینەی خۆمان دەدەین ئاواش گرنگیمان بەو خێزانەمان دەدا. بڕوا بکە، کە نزیکدەبیتەوە لە مردن، بۆت دەردەکەوێ، کە ئەمە ڕاستە. ئێمە هەموومان هەمان سەرەتامان هەیە: لەدایکبوون، هەمووشمان هەمان کۆتاییمان دەبێت: مردن. ئەی کەواتە بۆ دەبێ ئەوەندە جیاواز بین؟

میچ، توانا و سەرمایە ناوەکییەکانت بخەرە کار بەئامانجی دروستکردنی ئەو خێزانە گەورەیە. خۆت لەخەڵک و دەورووبەرەکەتدا وەبەربهێنە. کۆمەڵگایەکی بچووک لە خۆت و ئەو کەسانە دروست بکە، کە خۆشت دەوێن و خۆشیان دەوێی.
بەنەرمی دەستی گوشیم. قایمتر دەستیم گوشییەوە. وەکو ئەو یارییەی کە چەکوشێک دەکێشیت بە ئامێرێکدا و دەبینیت دیسکێک بە بۆرییەکدا بەرز دەبێتەوە بۆ ئاسمان، ئاوا دەمبینی، کە پلەی گەرمی لەشم بەرز دەبێتەوە و بەدەستمدا دەڕوات بۆ (مۆریی)ش، بۆ دەست و سنگ و ڕوومەت و چاوەکانی. مۆریی هەستی بە گەرمبوونی دەستم کردو زەردەخەنەیەک گرتی.
- میچ، دەزانی لەسەرەتای ژیاندا کاتێک کۆرپەین، بۆ ئەوەی بمێنینەوە و گەورە ببین، پێویستمان بە خەڵکیترە، وایە؟ ئێ لەکۆتایی ژیانیشدا، ئەو کاتەی وەک منت لێدێ، پێویستمان بەخەڵکیترە، وایە؟
- وایە.
دەنگی نزم کردەوە تا ئاستی چرپە: بەڵام نهێنییەکە ئەمەیە کە پێتدەڵێم: لەنێوان ئەو دوو قۆناغەشدا هەر پێویستمان بەئەوانەی چواردەورمانە.

***

دوانیوەڕی ئەو ڕۆژە من و کۆنیی چوینە ژووری نوستنەکە بۆ ئەوەی لەتەلەفیزیۆنەوە تەماشای دادگاییەکەی (ئۆ جەی سیمپسن) بکەین. دیمەنەکان زۆر ناخۆش بوون. بەڕێوەبەرانی دادگاییەکە ڕووبانکردە سیمپسن و لیژنەی بڕیاردەر. سیمپسن جلێکی شینی لەبەردابوو. لەملایەوە پارێزەرەکانی دەوریاندابوو، لەولاشییەوە ئەو

پاریزگارە گشتییانەی کە دەیانویست لە بەندیخانەی توند بکەن کاتێک لیژنەی بەڕێوەبردنی دادگاییەکە بڕیاری کۆتایی خوێندەوە و گوتی «تاوانبار نییە» کۆنیی هاوارێکی لێبەرزبۆوە.

بینیمان سیمپسن باوەشی بە پارێزەرەکانیدا کرد. گوێمان گرتبوو بزانین بێژەر و ئەوانەی دادگاییەکەیان دەگواستەوە دەڵێن چی لەسەر بڕیارەکە. کەناڵەکە لەهەمانکاتدا وێنەی دەرەوەشی دەگواستەوە و لەبەردەم بینای دادگاکەدا سەدان ڕەش پێست کۆببوونەوە و لەخۆشیاندا هاواریان دەکرد و ئاهەنگیان دەگێڕا، لەهەمانکاتدا وێنەی سپی پێستەکانیش دەردەکەوت، کە لەڕێستۆرانتەکاندا بەحەپەساوی دانیشبوون. هەرچەندە ڕۆژانە حاڵەتی کوشتن لێرە و لەوێ ڕوویاندەدا، بەڵام ئەم حاڵەتە و بڕیاری بێتاوانیی سیمپسن زۆر بەگرنگ باسیان لێوەکرا. کۆنیی چیتر نەیویست تەماشای تەلەفزیۆنەکە بکات و ڕۆیشت بۆ مۆڵەکە. گوێم لێبوو دەرگای ژوورەکەی مۆریی پێوەدرا. هێشتا هەر چاوم لەسەر تەلەفیزیۆنەکە بوو. بەخۆمم گوت: ئێستا هەموو دونیا سەیری ئەم دادگاییە دەکەن.

لەمکاتەدا لەژوورەکەی ترەوە دەنگێک هات. زانیم (کۆنیی)ە و مۆریی لەسەر کورسییەکەی بەرزدەکاتەوە. بەمشێوەیە لەگەڵ ساتی تەولو بوونی (دادگایی سەدە)دا، مۆریی گەیشتە سەر قەعدەکەی.

* * *

ساڵی ١٩٧٩ یە. یارییەکی باسکە لە هۆڵی وەرزشیی زانکۆی براندیس ڕێکخراوە. تیپەکەمان زۆر بەهێزە. خوێندکارەکان هەموو پێکەوە هاوار دەکەن: هەر خۆمان یەکەمین، یەکەم هەر خۆمانین. مۆریی لەنزیکیانەوە دانیشتووە. سەری سوڕماوە لەو هەموو هاوارهاوار و گەرمبوونە. دوای کەمێک کاتێک خوێندکارەکان لەناوەڕاستی ڕستەکەیاندان: هەر خۆمان یە... مۆریی هەڵدەستێت هاواریان لێدەکات: ئەرێ پێم ناڵێن دووەمیی چ خراپیەکی تێدایە؟

خوێندکارەکان لەهاوار هاوار دەوەستن. هەموو سەیری مۆریی دەکەن. مۆریی بە زەردەخەنەیەکەوە لەسەر ڕووخساری دادەنیشێتەوە.

# بەرنامە تەلەفیزیۆنییەکە، بەشی سێیەم

ئامادەکارانی بەرنامەی (نایت لاین) هاتنەوە بۆ ئەوەی سێیەم و کۆتا چاوپێکەوتن لەگەڵ مۆریی بکەن. چاوپێکەوتنی ئەمجارە لە دوو جارەکەی پێشوو جیاوازتربوو. کەمتر لەچاوپێکەوتن و زیاتر لە ماڵئاواییکردن دەچوو. تێد کۆپێڵ پێش ئەوەی بێت چەندینجار لەرێگەی تەلەفۆنەوە لە مۆریی پرسیبوو، کە ئەگەر ناتوانێت چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ ناکەن. مۆریی دڵنیانەبوو دەتوانێت، یان نا. لەهەموو جارەکاندا بە (تێد)ی دەگوت: نازانم تێد، ئێستا بەردەوام هیلاکم. زوو زووش خەریکە دەخنکێم. ئەگەر لەچاوپێکەوتنەکەدا وەستام و نەمتوانی شتێک بڵێم، تۆ بۆم تەواو دەکەی؟

هەموو جارێک کۆپێڵ وەڵامی دەدایەوە: بەدڵنیاییەوە مۆریی گیان.

دواجار کە پێکەوە لەسەر تەلەفۆن قسەیانکرد، تێد لە مۆریی پرسییەوە: مۆریی، تکایە ئەگەر ناتەوێ ئەم چاوپێکەوتنەیان بکەی، زۆر ئاساییە، بەڵام بۆخۆم هەردێم بۆ لات بۆ ماڵئاوایی.

مۆرییش کە دایخستبۆوە بەپێکەنینێکەوە گوتبووی: ئەوە خەریکە لەمیشی بەرینەوە.

لێشی بردەوە.

ئێستا کۆپێڵ، مۆریی بە هاورێی خۆی دەزانی. بەمشێوەیە مۆریی

تەنانەت خۆشەویستی و سۆزی (تێد)یشی بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو.

ڕۆژی چاوپێکەوتنەکە، کە دوانیوەڕۆیەکی هەینی بوو، مۆریی هەمان ئەو کراسەی لەبەریبوو کە ڕۆژی پێشتر لەبەریکردبوو. مۆریی ڕۆژناڕۆژێک کراسەکانی دەگۆڕی، لەبەرئەوە پێیوابوو هیچ پێویست ناکات واز لەو ڕۆتینە بهێنێت و بۆ چاوپێکەوتنەکە کراسەکەی بگۆڕێت.

جیاواز لە دوو چاوپێکەوتنەکەی پێشوو، ئەم چاوپێکەوتنەیان لە ژوورەکەی مۆریی کرا، ئەو ژوورەی تیایدا مۆریی ببووە زیندانی کورسی و عەرەبانەکەی. تێد مامۆستا کۆنەکەمی بینی و ماچیکرد، ئینجا لەتەنیشت کتێبخانە بچووکەکەیەوە دانیشت بۆ ئەوەی بەباشی لەکامێراکەدا دەربکەوێ. پێش ئەوەی دەست بە چاوپێکەوتنەکە بکەن، تێد پرسیاری لە مۆریی کرد لەسەر بەرەو پێشچوونی نەخۆشییەکەی.

- (ئەی ئێڵ ئێس)ەکە تا کوێ سەرکەوتووە؟

مۆریی بەلاوازیی دەستێکی بەرزکردەوە، تا نزیکی سکی. لەوە زیاتر نەیدەتوانی دەستی بەرز بکاتەوە.

کۆپێڵ وەڵامی پرسیارەی وەرگرت.

کامێراکە دەستی کرد بە وێنەگرتنی چاوپێکەوتنی سێیەم و کۆتایی. کۆپێڵ پرسیاری لە مۆریی کرد: ئێستا دوای ئەوەی مردن نزیکتر بۆتەوە هەست بەترسێکی زیاتر ناکەی؟

مۆریی وەڵامەکەی بە (نەخێر)دایەوە. ئەگەر ڕاستت دەوێ، کەمتریش دەترسا.

مۆریی گوتی کە ئێستا گرنگی بەزۆر شتی دەرەوە نادات، ڕۆژنامەکانی بۆ ناخوێنێتەوە و زۆریش گرنگی بە نامەکان نادات، لەجیاتی ئەوە گوێ بۆ گۆرانی و مۆسیقای خۆش دەگرێت، هەروەها

لە پەنجەرەکەوە سەرنجی گەڵاکان دەدات، کە چۆن ڕەنگەکانیان دەگۆڕێنت.

کەسێتریش هەبوون بەدەست نەخۆشی (ئەی ئێل ئێس)ەوە دەیانناڵاند، تەنانەت هەندێکیان بەناوبانگ بوون و مۆریش دەیناسین، بۆ نموونە (ستیڤن هۆکینگ)، کە فیزیازانێکی زۆر لێهاتووە و نووسەری کتێبی (کورتیلەیەک لە مێژووی کات)ە. هۆکینگ بۆ هەناسەدان کونیان کردبووە قوڕگی، لەڕێگەی مایکرۆفۆنی زۆر هەستیاری کۆمپیوتەرییشەوە قسەی دەکرد و لێی تێدەگەیشتن، لەسەرو ئەوانەشەوە بەجوڵەی چاو لەسەر شاشەیەکی ئەلیکترۆنی دەینووسی. ئەمانە هەموو شتی باش دیارن، بەڵام مۆری نەیدەویست ماوەی نەخۆشییەکەی بەوشێوەیە بەرێتەسەر. بە (کۆپێل)ی گوت، کە دەزانێت کەی کاتی ماڵئاواییەکەیەتی.

- تێد، لای من زیندووبوون ئەوەیە بتوانم لەگەڵ بەرامبەرەکەم کراوەبم. مەبەستم ئەوەیە بتوانم هەست و نەستەکانی خۆم لەبەردەمیدا هەڵڕێژم، قسەی لەگەڵ بکەم، هەستەکانمان لەگەڵ یەکتریدا هاوبەشیی پێبکەین...

کەمێک وەستا و ئینجا لەگەڵ هەناسەیەکدا گوتی: کە ئەوە نەما، منیش نامێنم.

(تێد) و مۆریی هەر وەک دوو هاوڕێ پێکەوە قسەیان دەکرد. بەهەمانشێوەی دوو چاوپێکەتنەکەیتر، ئەمجارەش تێد دەربارەی چوونەسەرئاو و خۆپاکردنەوە پرسیاری لە مۆریی کرد. ڕەنگە بۆ ئەوە پرسیاری وای کردبێت تا وەک جاری پێشوو وەڵامێکی پێکەنیناوی دەستبکەوێت، بەڵام ئەمجارەیان مۆریی توانا و کەیفی زەردەخەنەشی نەبوو لە وەڵامی پرسیارێکی ئاوادا.

سەرنجێکی بۆ تێد لەقاند و گوتی: کاتێک لەسەر قەعدەکەم

دادەنیشم، ناتوانم رێک خۆم بگرم بۆیە دەبێ یەکێک بمگرێ و کە تەواویش بووم پاکم بکاتەوە. تا ئێستا گەیشتۆتە ئەوێ.
مۆریی بە (کۆپێڵ)ی گوت، کە دەیەوێت مردنێکی هێمن بمرێت.
ئەو ڕۆژە هەر لەکاتی چاوپێکەوتنەکەدا مۆریی تازەترین وتەی خۆی بەهەمووموان گوت: زوو خۆت بەدەستەوە مەدە، بەڵام نکوڵییش لەکۆتایی هاتن مەکە.
کۆپێڵ بەخەمبارییەوە سەری لەقاند.
تەنها شەش مانگ تێپەڕیبوو بەسەر چاوپێکەوتنی یەکەمدا، بەڵام مۆریی لەڕووی جەستەییەوە بەتەواوی تێکشکابوو. بەبەرچاوی بینەرانی کەناڵێکی سەرەکیی وڵاتەکەوە قۆناغەکانی مردنی خۆی دەبڕی، بەڵام لەگەڵ رزینی جەستەیدا تادەهات زیاتر و زیاتر کەسایەتیی ناوەوەی دەدرەوشایەوە.
کاتێک چاوپێکەوتنەکە خەریکبوو تەواو دەبوو، کامێراکە ئەوەندە مۆریی هێنایە پێشەوە کۆپێڵ بەهیچ شێوەیەک دیارنەما، تەنها دەنگی دەبیسترا. تێد لە مۆریی پرسی کە ئەگەر شتێکی هەیە بۆ ئەو ملیۆنان کەسەی لەوکاتەدا سەیری ئەویان دەکرد، بیڵێت. هەرچەندە کۆپێڵ پرسیارەکەی بەمشێوەیە نەکرد، بەڵام کە وای گوت من لای خۆمەوە پیاوێکی حوکمدراو بە سێدارەم هاتە بەرچاو، کە پێش هەڵواسینەکەی داوای لێدەکەن دوا وشەی ژیانی بڵێت.
مۆریی بەدەنگێکی نزم گوتی: داواتان لێدەکەم گرنگی بە یەکتر بدەن، هەست بەئازارەکانی یەکتر بکەن، لەبەرامبەر یەکتردا هەست بە لێپرسراوێتی بکەن. دڵنیاتان دەکەم ئەگەر فێری ئەو شتانە ببن ئەم هەسارەیە زۆر جوانتر و خۆشتر دەبێ.
هەناسەکی هەڵکێشا و ئەو وتەیەی دووبارە کردەوە، کە زۆری بەلاوە گرنگ بوو: یان یەکتریتان خۆش بوێ یان بمرن.

چاوپێکەوتنەکە کۆتایی هات، بەڵام بەمەبەست وێنەگرەکە کامێراکەی نەکوژاندەوە. بەمشێوەیە دوادیمەنیش وێنەگیرا.
کۆپێڵ بە مۆریی گوت: بەم چاوپێکەوتنانە ئیشێکی زۆر چاکت لەگەڵ کردین.
مۆریی زەردەخەنەیەکی کەمی کرد و بەچرپە گوتی: ئەوەی پێمبوو پێمدای.
- تۆ هەمیشە هەر وا بەخشندە بووی.
- تێد، ئەم نەخۆشییە دەیەوێ ڕۆحیشم تێکدا، بەڵام شتی وای دەستناکەوێ. جەستەم دەبا، بەڵام دەستی بە ڕۆحم ناگات.
کۆپێڵ بەدڵپڕییەوە گوتی: هەموو شتێکت بەباشترین شێوە کردووە لەژیانتدا.
مۆریی وەڵامی دایەوە: بەڕاست؟
ئینجا سەرێکی هەڵبڕی و بەدەم سەیرکردنی سەقفەکەوە بەردەوامبوو: تێد، ئێستا خەریکم مامەڵەی خۆم لەگەڵ ئەوەی سەرەوەدا دەکەم. لێی دەپرسم: چانسی ئەوەم دەبێ ببم بە فریشتە، یان نا؟
ئەوە یەکەمجاربوو مۆریی دانی نا بەقسەکردن لەگەڵ خوادا.

## سێشەممەی دوانزەیەم
## باسی لێخۆشبوون دەکەین

پێش ئەوەی بمری، لەخۆت خۆشبە، ئینجا لەوانیتریش.

ئەمە دوای چەند ڕۆژێک بوو لەچاوپێکەوتنەکە. کەش باراناویی و ئاسمان تاریک بوو. (مۆریی)ش لەژێر بەتانییەکەیەوە بوو. لەبەشی خوارەوەی جێگاکەی دانیشتم و دەستم خستەسەر قاچە ڕووتەکانی. پێستەکەیان کەمێک ڕەق ببوو، نینۆکەکانیشی زەرد ببوون. قوتویەکی بچووک کرێمم پێبوو. کەمێکم خستەسەر دەستم و کەوتمە شێلانی قاچ و قولەپێکانی.

بەدرێژایی چەند مانگی پێشوو بینیبووم، کە یارمەتیدەرەکانی ئەوەیان بۆ دەکرد و منیش لەوانەوە فێرببووم. ئێستاش وەک تاکە شت کەلەتوانامدا بوو بۆ مامۆستا کۆنەکەمی بکەم، پێمخۆش بوو ئەوجارە من قاچی بۆ بشێلم. نەخۆشییەکە بەشێوەیەک کاری لەقاچەکانی کردبوو، کە تەنانەت نەیدەتوانی پەنجەکانیشی بجولێنێت، بەلام هێشتا هەستییان تێدامابوو. ئازاریان دەهات بەو شێلانە ئازارەکەیان کەمی دەکرد. هۆکارێکیتریش ئەوە بوو مۆریی خۆی زۆر حەزی لەوە بوو هەلیبگریت و دەستی لێبدەیت. لەم قۆناغەدا بە هەرشتێک بمتوانیایە ئەو مامۆستا کۆنەم دڵخۆش بکەم دەمکرد.

گەڕابەوە سەر باسی لێخۆشبوون: هیچ، هێشتنەوەی ڕق و ...
ر کەللەڕەقی هیچ سودێکی نییە. ئەم شتانە..
ئامێکی هەڵکێشا: من زۆر لەم شتانە پەشیمانم ئەم هەموو
خۆ خۆشویستن و خۆبەزلزانینە لەپای چی؟ باشە ئێمە بۆ ئاوا
دەکەین؟!

داوای من لە مۆریی ئەوەبوو گرنگیی لێخۆشبوونم بۆ ڕوونبکاتەوە
زۆرم لەو فلیمانە بینیبوو، کە باوکەکە پێش ئەوەی لەسەر جێگاکەی
گیان بسپێرێت، داوا دەکات کوڕە یاخییەکەی بێت بۆلای بۆئەوەی
ئاشت ببێتەوە لەگەڵی.

ویستم بزانم مۆریی هەستدەکات پێش مردنی پێویستی بەوەیە
بڵێت «داوای لێبوردنتان لێدەکەم»

سەرێکی لەقاند و لێی پرسیم: ئەو پەیکەرە دەبینی؟
نیوە ئاوڕێکی دایەوە و سەیری پەیکەرێکی بچووکی کرد، کە
لەسەر یەکێک لەڕەفە بەرزەکانی کتێبخانەی بوو. بەڕاستی پێشتر
نەمبینیبوو. پەیکەرەکە لە برۆنز دروستکرابوو، دەموچاوی پیاوێکی
تەمەن مامناوەند بوو، بۆینباخێکی لەملدابوو، کەمێکیش قژی
هاتبووە سەر ناوچاوانی.

مۆریی گوتی: ئەوە منم. یەکێک لەهاوڕێکانم سی ساڵێک پێش
ئێستا دروستیکرد. ناوی (نۆرمان) بوو. زۆربەی کات پێکەوەبووین،
دەچووین بۆ مەلە، سەردانی (نیویۆرک)مان دەکرد و زۆر شتیتریش.
جارێک بردمی بۆ ماڵەکەی خۆی لە کامبریج. لەوێ لەژێر زەمینەکە
ئەم پەیکەرەی دروستکرد. لەڕاستیدا چەند هەفتەیەک خەریکی بوو،
بەڵام چونکە مەبەستی بوو تەواوی بکات، بەجوانی تەواوی کرد.
سەیرێکی دەموچاوەکەم کرد. شتێک کە هەستێکی سەیری
تێدا دروستکردم بینینی ئەو (مۆریی)ە سێ ڕەهەندییە بوو، کە

بەرووخسارێکی تەندرووست و جوانەوە لەو سەرەوە سەیری ئێمەی دەکرد. هەرچەندە پەیکەرەکە لە برۆنز دروستکرابوو، بەڵام هێشتا سەیرکردنی چاوەکانی مۆریی سیحرێکی سەیری لێدەکردی. هەر لەبەر ئەوە بوو لەدڵی خۆمدا گوتم: ئەم کابرایە جگە لە دەموچاوێک پەیکەری بۆ ڕۆحێکیش دروستکردووە.

مۆریی گوتی: بەشە ناخۆشەکەی چیرۆکەکە ئەمەیە. نۆرمان و ژنەکەی ڕۆیشتن لە شیکاگۆ بژین. پاش ماوەیەکی کەم، دەبوو نەشتەرگەرییەکی قورس بۆ (شارلۆت)ی هاوسەرم بکرێ. نۆرمان و ژنەکەی هیچ پەیوەندییەکیان پێوە نەکردین. دەمزانی هەواڵەکەیان بیستووە. بەڕاستی من و شارلۆت پێمان ناخۆش بوو، کە تەنانەت تەلەفۆنێکیشیان نەکرد بۆ هەواڵپرسی. بەوشێوەیە پەیوەندییمان لەگەڵیان پچڕا.

دوای چەند ساڵێکی زۆر، چەند جارێک (نۆرمان)م بینییەوە و هەموو جارێک هەوڵیدەدا ئاشت بێتەوە لەگەڵم، بەڵام من قبوڵم نەدەکرد. پاساوەکانی بە ئەقڵمدا نەدەچوون. فیزم تێدا دروست ببوو. هەموو جارێک ڕەتم دەکردەوە پەیوەندی لەگەڵ دروست بکەمەوە.

مۆریی تەواو دڵی پڕبوو.

- میچ، پێش چەند ساڵێک، نۆرمان بەشێرپەنجە کۆچی دوایی کرد و هەرگیز نەمبینییەوە. هەرگیز نەمتوانی لێی خۆشبم. ئێستا ئەم شتە زۆر ئازارم دەدا، زۆر.

دەستیکرد بەگریان، گریانێکی بێدەنگ و هێواش. لەبەرئەوەی سەریشی بەدوادا خستبوو فرمێسکەکانی لە ئەملا و ئەولای دەموچاوییەوە دەکەوتنە خوارێ.

- زۆرم پێناخۆشە ئەو مەسەلەیە ئاوا ئازارت دەدا.

- پێت ناخۆش نەبێ، فرمێسک زۆر ئاساییە.

بەردەوامبووم لەشێلانی قاچ و پەنجەکانی. بەدەم بیرکردنەوە لە یادگارییەکانی، بەتەنها بۆ خۆی چەند خولەکێک گریا. دواجار گوتی: میچ، ئەوە تەنها کەسانی بەرامبەرمان نین، کە دەبێ لێیان خۆشبین، بەڵکو پێویستمان بەوەیە لەخۆشمان خۆشبین.

- لەخۆمان؟!

- بەڵێ، لەخۆمان. پێویستە لەخۆمان خۆشبین بۆ ئەو شتانەی دەبوو بیانکەین و نەمانکردن. ناتوانی تاهەتایە خەفەت بۆ ئەوە بخۆی کە ڕوویندا. ئەوکاتەی دەگەیتە ئەم تەمەن و حاڵەی من، ئەوە زۆر ئازارت دەدا. من هەمیشە دەمویست زیاتر لەئیشەکەمدا قووڵ ببمەوە و کتێبی زیاتر بنووسم. کە نەمدەتوانی ناچار بەتوندی زەرزەنشتی خۆمم دەکرد، بەڵام ئێستا دەزانم ئەوە هیچ سوودێکی پێنەگەیاندووم. ئاشتبەرەوە، پێویستە لەگەڵ خۆت و دەورووبەرەکەت و دوور و نزیکدا ئاشتی ڕابگەیەنی.

خۆم درێژکرد و بە دەستەسڕێک فرمێسکەکانیم بۆ سڕی. خێرا خێرا چاوەکانی دادەخست و دەکردەوە. بەئاسانی گوێت لە هەناسەکانی دەبوو، دەتگوت بەدەنگێکی نزم دەپرخێنێت.

- لەخۆت خۆشبە. لە خەڵک خۆشبە. کات بەفیڕۆ مەدە میچ! هەموو کەس ئەوەندەی کات نابێ، کە من هەمە. هەموو کەس وەک من بەبەخت نییە.

دەستەسڕەکەم خستە سەبەتەی خۆڵەکەوە و چوومەوە لای قاچەکانی. پەنجە گەورەم لەسەر پێستە ڕەقەکەی قاچی داگرت، بەڵام ئەو هەستی بەهیچ نەدەکرد. ئاواش بەخۆی دەگوت «بەبەخت»!

- میچ، دوو شتە دژبەیەکەکەت بیرە؟ ئەو دوو شتەی کە هەریەکەیان بەئاراستەیەک ڕاتدەکێشێت؟

- ئا ئا بیرمە.

- خەفەت دەخۆم، کە ئاوا کاتەکەم کەمدەبێتەوە، بەڵام دڵخۆشیشم بەوەی دەرفەتی ئەوەم هەیە شتەکان ڕاست بکەمەوە.

بۆ چەند ساتێک بەبێدەنگی دانیشتین. باران لەپەنجەرەکەی دەدا. گوڵەکانی ناو ئینجانەکانی پشت سەری هێشتا سەوز بوون و تا ئەو کاتەش بەرگەیان گرتبوو.

بەچپە بانگی کردم: میچ؟

- بەڵێ

پەنجەکانم دەخستە نێوان پەنجەکانییەوە و بەتەواوی دەچوومە ناو ئێشەکەوە.

- سەیرمکە.

سەرم هەڵبڕی و قووڵترین نیگام بینی لە چاوەکانیدا.

- نازانم تۆ بۆچی هاتیتەوە بۆ لام، بەڵام دەمەوێ ئەمە بڵێم...

وەستا و دڵی پڕ بوو: ئەگەر کوڕێکیترم هەبوایە، حەزمدەکرد تۆ بی.

سەرم داخست و بەردەوامبووم لەسەر شێلانی قاچە نیوە مردووەکانی. بۆ ساتێک هەستم بە ترس کرد، وەک ئەوەی قبوڵکردنی قسەکانی خیانەتکردن بێت لە باوکم، بەڵام کاتێک سەرم هەڵبڕی، بینیم مۆریی لەگەڵ هاتنەخوارەوەی فرمێسکەکانیدا زەردەخەنەم بۆ دەکات. زانیم هیچ خیانەتێک لە ساتێکی وەهادا بوونی نییە.

من تاکە شتێکی کە لێی تۆقیبووم ماڵئاواییکردن بوو.

ـ شوێنێکم هەڵبژاردووە لێی بمنێژن.
ـ کوێیە؟
ـ زۆر لێرەوە دوور نییە. لەسەر گردێکە و بەسەر ڕووبەرە ئاوێکی بچووکدا دەڕوانێ. ژێر دارێکم هەڵبژاردووە. زۆر ئارامە و شوێنێکی باشە بۆ بیرکردنەوە.
ـ بەنیازی لەوێ بیربکەیتەوە؟
ـ بەنیازم لەوێ بمرم.
هەردووکمان پێدەکەنین.
ـ سەردانم دەکەی؟
ـ سەردان؟!
ـ هەر وەرە و قسەم بۆ بکە. سێشەممان وەرە. تۆ هەمیشە لە سێشەمماندا دێی.
ـ ئێمە خەڵکانی سێشەممەین مۆریی گیان.
ـ ڕاست دەکەی میچ، خەڵکانی سێشەممەین. وەرە و قسەم بۆ بکە، باشە؟
دوای وەستانێک دەڵێت: سەیرمکە.
سەیری دەکەم.
ـ دێیت بۆ سەر گۆڕەکەم؟ باسی کێشەکانتم بۆ دەکەی؟
ـ کێشەکانم؟
ـ بەڵێ کێشەکانت.

ـ ئەی تۆ وەڵامم دەدەیتەوە؟!
ـ ئەوەی پێمبکرێ بۆت دەکەم. هەمیشە وامنەکردووە؟
گۆڕەکەی مۆریی دەهێنمە بەرچاوی خۆم: لەسەر گردێک، کە بەسەر ئاوێکدا دەڕوانێت، چاڵێکی دوو مەتریی هەڵدەکەنن و مۆریی دەخەنەناو، ئینجا خۆڵەکە دەدەنەوە بەسەریدا و کیلێکیشی بۆ دادەنێن. دەیهێنمە بەرچاوی خۆم، کە چۆن دوای چەند هەفتەیەک، یان چەند ڕۆژێک لەمردنی، بەتەنها دەچمەوە سەر گۆڕەکەی و دەستەوئەژنۆ دادەنیشم، سەیری ئاسمان دەکەم و دەگریم.
پێی دەڵێم: بەڵام مۆریی گیان من ئەوکاتە ناتوانم گوێم لە قسەکانت بێ، ئەوە پێکەوەبوونەکەمان زۆر جیاواز...
قسەکەم پێدەبڕیت: نا میچ نا!
چاوەکانی دادەخات و زەردەخەنەیەک دەیگرێت.
ـ دەزانی چی میچ، ئەوکاتە تۆ قسەبکە و من گوێ دەگرم.

## سێشەممەی سیانزەیەم

# باسی خۆشترین ڕۆژ دەکەین

مۆریی دەیویست لاشەکەی لە کورەدا بسوتێندرێت. ئەم بابەتەی لەگەڵ شارلۆت باسکردبوو، هەردووکیشیان گەیشتبوونە ئەو بڕوایەی کە ئەوە باشترین هەڵبژاردنی بەردەمیانە. بەڕێوەبەری پەرستگاکەی براندیس کە ناوی (ئاڵ ئاگزیلارد) بوو، هاوڕێیەکی کۆنی مۆریی بوو بۆیە ئەویان هەڵبژاردبوو مەراسیمی بەخاکسپاردنەکە بەڕێوەبەرێت. ئاڵ سەردانی مۆریی کردبوو، مۆرییش پلانی سوتاندنەکەی باش بۆ شی کردبۆوە.

- یەک شتیتریش، ئاڵ.

- چی؟

- بەقوربانە ئاگات لێبێ زۆر نەمبرژێنن.

ئاڵ نەیزانی چی بڵێت، بەڵام مۆریی دەیتوانی لەسەر جەستەی خۆی نوکتەش دروست بکات. هەتا زیاتر لە مردنەکەی نزیک دەبۆوە، زیاتر جەستەی خۆی وەک قەپاغێک دەبینی، شتێک کە ڕۆحەکەیان تێکردبوو. لە ئێستادا جەستەی ببووە پێستێکی بێکەڵک و چەند ئێسقانێک ئەمەش وایدەکرد مۆریی ئاسانتر دەستبەرداری بێت.

دانیشتم و مۆریی پێیگوتم: ئێمە زۆر لە ڕووبەڕووبوونەوەی مردن

دەترسین
مایکرۆفۆنەکەم لەسەر ئێخەی کراسەکەی جێگیرکردەوە. بەڵام هەر دەکەوتەوە خوارەوە. چەند جارێک کۆکی. ئێستا بەردەوام دەکۆکی.

بەردەوامبوو: لەمرۆژانەدا کتێبێکم خوێندەوە. دەیگوت کاتێک کەسێک لە نەخۆشخانە دەمرێ، خێرا پارچە پەڕۆیەک دەدەن بەسەر دەموچاویدا و دەیبەن دەیخەنە کوورەکەوە. دەیانەوێ بەزوویی لەبەر چاویان نەمێنێ، وادەزانن مردن سارییە و لەیەکێکەوە بۆ یەکێکیتر دەگوێزرێتەوە.

تۆزێک خۆم بە مایکرۆفۆنەکەوە خەریککرد. مۆریی هەر سەیری دەستی دەکردم.

- مردن ساریی نییە، ئەویش وەک ژیان شتێکی زۆر سروشتییە. خاڵێکی ئەو رێککەوتنەیە، کە ئیمزامان کردووە.

دووبارە کۆکییەوە، منیش کەمێک هاتمە دواوە و چاوەڕێمکرد تا لە کۆکەکەی تەواو بوو. مۆریی ماوەیەک بوو شەوان حاڵی زۆر خراپ بوو، شەوەکانی زۆر ترسناک بوون. تەنها دەیتوانی چەند سەعاتێکی کەم بخەوێت و زوو زوو لەتاو کۆکە و ئازار خەبەری دەبۆوە. لەوکاتانەشدا سستەرەکان دەهاتن بۆ لای و دەستیان بەپشتیدا دەکێشا بۆئەوەی ژەهری ناو سییەکانی دامرکێننەوە. تەنانەت ئەگەر بشیانتوانیایە هەناسەدانی ئاسایی بکەنەوە، بێگومان مەبەستم بە ئامێری ئۆکسجینەکەیە، تا رۆژی دواتر هەر بەشەکەتی دەمایەوە.

ئامێری ئۆکسجینەکە لەسەر لوتی بوو. زۆرم رق لەو دیمەنە بوو. لای من مانای ئەوپەڕی بێدەسەلاتیی دەگەیاند. دەمویست لای بەرە لەسەر لوتی.

لەسەرخۆ گوتی: دوێنێ شەو...
- نێ! دوێنێ شەو چی؟
- بۆ چەند سەعاتێک حاڵم زۆر خراپ بوو. بەڕاستی دڵنیانەبووم بۆ دەکەمەوە، یان نا. هەناسەم بۆ نەدەدرا، خەریکبوو دەخنکام واملێهات هەستم بە گێژی دەکرد....دوای ئەوە ئارامبوومەوە و هەستمکرد ئامادەم بۆ سەفەرەکەم.
تا توانی چاوەکانی کردەوە و گوتی: میچ، هەستێکی زۆر خۆشی هەبوو، مەبەستم ئەو قبوڵکردن و ئارامبوونەوەیەیە. بیرم لەخەونێک دەکردەوە، کە هەفتەی پێشوو بینیبووم. لەخەوەکەدا بەسەر پردێکدا دەپەڕیمەوە بۆ شوێنێک، کە نەمدەزانی کوێیە. ئامادەبووم بەردەوامبم لەڕۆیشتن بۆ هەر شوێنێک بووایە.
- بەڵام نەڕۆیشتی، وانییە؟
مۆریی بۆ ساتێک بێدەنگ بوو، ئینجا کەمێک سەری لەقاند و گوتی: نا نەڕۆیشتم، بەڵام هەستمکرد دەتوانم بڕۆم. تێدەگەی مەبەستم چییە؟ ئەوە ئەو شتەیە، کە هەموومان داوای دەکەین: مردنێکی ئارام. ئەگەر لەکۆتاییدا بۆمان دەرکەوێ کە دەتوانین مردنێکی ئارام بمرین، کەواتە دەشتوانین شتە قورسەکە بکەین.
- شتە قورسەکە چییە؟
- بەئاسوودەیی بژین.
داوای لێکردم ئەو ئینجانەیەی بۆ بێنم کە گوڵە زەنبەقەکەی تێدابوو. بەدەستێک هەڵمگرت و بۆ چەند ساتێک لەنزیک چاوییەوە ڕامگرت. پێکەنی و دووبارە دەستیکردەوە بە قسە: مردن زۆر سروشتییە، بەڵام هۆکاری ئەوەی ئەم هەموو هات و هاوارەمان ناوەتەوە لەسەری ئەوەیە ئێمە خۆمان بە بەشێک لەسروشت نازانین. پێمانوایە لەبەرئەوەی مرۆڤین، ئیتر شتێکین لەسەر و سروشتەوە.

لەدوای سەیرکردنی گوڵە زەنبەقەکەوە زەردەخەنەیەکی کرد: بەڵام
وتی: هەرشتێک کە لەدایکبوو، دەشمرێ.
سەیرێکی منی کرد و لێی پرسیم: قبوڵتە؟
بەڵێ
ئینجا بەچرپە پێیگوتم: پێمخۆشە. ئێمە دەبێ ئەوەمان لەبیر بێ، چونکە ئەوەیە جیامان دەکاتەوە لەم ڕووەک و ئاژەڵە جۆراوجۆرانە. ئەگەر یەکتریمان خۆشبوێ و ئەو خۆشەویستییەشمان بیر نەچێ کە لەبەرامبەرماندا هەمانبووە، دەتوانین بشمرین و ئێرەش بەجێ بهێڵین. ئەو خۆشەویستییەی بنیاتت ناوە لێرە دەمێنێتەوە، هەموو یادگارییەکان لێرە دەمێننەوە، لەو دڵانەدا کە خۆشتویستوون و گرنگییت پێداون، لێرە بەردەوام بەزیندوویی دەمێنێتەوە.
لەگەڵ بەردەوامبوونی لەقسەکردن تادەهات دەنگی نزمتر دەبۆوە، ئەمەش مانای وابوو، کە دەبێت بۆ چەند ساتێک بوەستێت. ئینجانەکەم خستەوە سەر تاقی پەنجەرەکە و چووم تۆمارکەرەکە بکوژێنمەوە. دوا ڕستەی مۆریی پێش ئەوەی دەستم بکاتە دوگمەی کوژاندنەوەکە ئەمەبوو: مردن کۆتایی بە ژیانمان دەهێنێ، نەک بە پەیوەندییەکانمان!

***

دۆزینەوە چارەسەری نەخۆشی ئەی ئێل ئێس چەند بەرەو پێشچوونێکی بەخۆوە بینیبوو. دەرمانێک دۆزرابۆوە، کە ڕاڕەوی هەوای فراوان دەکرد و هەناسەدانی ئاسانتر دەکرد. لەڕاستیدا چارەسەر نەبوو تەنها بۆ چەند مانگێک مردنی نەخۆشەکەی دوادەخست. مۆریی بیستبووی کە شتێکی وەها هەیە، بەڵام حاڵەتەکەی مۆریی زۆر لەوەندە چووبووە پێشەوە، کە تازە دەرمان سوودی نەبوو.

سەرەڕای ئەوەش ئەو دەرمانە دوای چەند مانگێکیتر ئینجا دەکەوتە بازاڕەوە.

مۆریی بیرۆکەکەی ڕەتدەکردەوە و دەیگوت: شتی وام ناوێ.

بەدرێژایی ئەو ماوەیەی نەخۆش ببوو مۆریی هەرگیز هیوای چاکبوونەوەی نەخواستبوو. زیاد لە پێویست واقیعیانە سەیری نۆخەکەی دەکرد. جارێکیان لێم پرسی ئەگەر یەکێک بهاتایە و بەدارێکی سیحریی چارەسەری تەواوی بۆ بکردایە، هەر دەبووەوە بەو (مۆریی)ەی پێش نەخۆشییەکە؟

سەرێکی بادا و وەڵامی دامەوە: بەهیچ شێوەیەک نەدەبوومەوە بەهەمان مۆریی. من ئێستا کەسێکیترم، هەڵوێستەکانم جیاوازن. ئێستا بەشێوەیەکی جیاواز بەجەستەی خۆم دەزانم و ڕێزی دەگرم، بەڵام لەپێشدا وانەبووم. ئێستا جیاواز لەجاران مامەڵە لەگەڵ پرسیارە گەورەکان دەکەم، پرسیارە گرنگەکان، ئەو پرسیارانەی لێمان نابنەوە، بەڵام لەپێشدا وانەبووم. مرۆڤ کاتێک دەستی لەو پرسیار و وەڵامە گەورە و گرنگانە گیر دەبێ، هەروا بەئاسانی وازیان لێناهێنێ.

- کامانەن پرسیارە گرنگەکان؟

- وەک ئەوەی من لێی تێگەیشتووم، پرسیارە گەورەکان ئەو پرسیارانەن، کە پەیوەندییان بە خۆشەویستیی و بەرپرسیارێتیی و ڕۆحانییەت و هۆشیاربوونەوەوە هەیە. ئێستا ئەگەر زۆریش تەندروست بوومایە گرنگترین شتەکان لەلام هەر ئەو شتانە دەبوون. لەڕاستیدا دەبووایە هەموو ژیانیشم هەر ئەوانە بوونایە.

هەوڵمدا مۆریی بەتەندروستییەکی باشەوە بهێنمە بەرچاوی خۆم، مۆرییەک، کە بەتانییەکان لادەدات و بەقاچی خۆی لە جێگاکەی دێتەخوارەوە، ئینجا پێکەوە دەڕۆینە دەرەوە پیاسەیەک بەر

کۆڵانانەی دەوروبەری ماڵی خۆیاندا دەکەین، بەوشێوەیەی لەزانکۆ پیاسەمان دەکرد. لەناکاو بیرم کەوتەوە، کە من شانزە ساڵە مۆرییم بەپێوە نەدیوە، شانزە ساڵ!

لێمپرسی: چیت دەکرد ئەگەر یەک ڕۆژ زۆر تەواو تەندروست بوویتایە و هیچ ئازاێکت نەبووایە؟

- یەک ڕۆژ! واتە بیست و چوار سەعات؟

- بەڵێ، بیست و چوار سەعات.

- بابیرێکی لێبکەمەوە...ئا، بەیانییەکەی هەڵدەستام، کەمێک ڕاهێنانی جەستەییم دەکرد، نانێکی باشی بەیانیم دەخوارد، ئینجا دەچووم بۆ مەلە، دوای ئەوەش بانگێشتی هاوڕێکانم دەکرد بێن نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین. یەک یەک یان دوو دوو بانگم دەکردن بۆ ئەوەی لەکاتی دانیشتنەکەماندا دەرفەتی ئەوەیان هەبێ بەدرێژی باسی ژیانی خۆیان خێزانەکانیانم بۆ بکەن، هەروەها بۆ ئەوەش کە بتوانین بەڕوونی بەیەکتر بڵێین، کە چەندە قەدرمان لای یەکتری هەیە. دوای ئەمانەش دەچووم بۆ باخچەیەکی پڕ دارودرەخت و سەوزایی، بەدەم پیاسەیەکی چاکەوە سەیری ڕەنگەکانم دەکرد و گوێم بۆ باڵندەکان دەگرت. لەگەڵ سروشت تێکەڵ دەبوومەوە، چونکە زۆر دەمێکە بەخزمەتی نەگەیشتووم. بۆ ئێوارەکەشی هەموومان پێکەوە دەڕۆیشتین بۆ ڕیستۆرانتێکی خۆش و پاستایەکی خۆش و گۆشت مراویمان دەخوارد، من زۆر حەزم لە گۆشتی مراوییە دەزانی. ئینجا تا شەو درەنگ سەمامان دەکرد. لەگەڵ هەموو سەماکەرەکانی ئەوێ سەمام دەکرد هەتا شەکەت دەبووم، لەکۆتاییشدا دەهاتمەوە و بۆخۆم خەوێکی قووڵ و خۆش لێی دەخەوتم.

- تەواو هەر ئەوەندە؟!

- ئەرێوەڵا هەر ئەوەندە.

هەموو ئـەو شـتانە شـتی زۆر سـادە بـوون. ڕاسـتییەکەی ئـەو وەڵامەی مۆریی کەمێک بێهیوای کردم. گوتم ئێستا دەڵێ بەفڕۆکە دەچووم بۆ ئیتاڵیا، یان لەگەڵ سەرۆکی وڵات نانێکم دەخوارد، یان دەچووم بۆ کەنار دەریا و هەرچی شتی خۆش هەیە دەمکرد. پێم سەیر بوو، کە دوای چەند مانگێک لە کەوتن لە جێگادا ڕۆژێکی ئاوا سادەی بەلاوە خۆشترین ڕۆژ بوو.

دواتر بۆم ڕوون بۆوە، کە خۆشبەختیی ڕاستەقینە هەر ئەوەیە.

***

ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی بڕۆم، مۆریی داوای لێکردم ئەگەر ئاسایی بێت بەلامەوە لەسەر بابەتێک قسەم لەگەڵ بکات.

- چ بابەتێک مۆریی گیان؟

- براکەت.

لەرزێکم پێداهات. نازانم مۆریی چۆن زانی ئەوە لەمێشکی منیشدا بوو. ئەو چەند ڕۆژە بەردەوام هەوڵمدابوو پەیوەندی بە براکەمەوە بکەم. لەڕێگەی هاوڕێیەکییەوە تەنها ئەوەندەم زانی، کە براکەم زوو زوو بۆ چارەسەر وەرگرتن دەبێت بچێتە ئەمستردام.

- میچ، دەزانم قورسە نەتوانی لەگەڵ کەسێک بی، کە خۆشت دەوێ، بەڵام دەبێ تۆ بەلاتەوە ئاسایی بێ براکەت چی دەوێ و پێی خۆشە شتەکان چۆن بڕۆن. ڕەنگە نەیەوێ تۆ ژیان و کاروباری خۆت بوەستێنی لەبەر خاتری ئەو. ڕەنگە ئەو ئەوەی پێقبوڵ نەکرێ. من بەهەموو کەسێکم گوتووە لەسەر ژیانی ئاسایی خۆیان بەردەوام بن و بەهۆی ئەم نەخۆشیی و مردنەی منەوە هیچ شتێک لە خۆیان تێکنەدەن.

منیش گوتم: بەڵام مۆریی گیان، ئەو برامە.

- دەزانم، میچ. هەر لەبەرئەوەشە مەسەلەکە ئازاربەخشە.

بەخەیاڵ (پیتەر)ی برامم هاتەوە بەرچاو ئەوکاتەی هەشت ساڵان بوو، قژە زەردەکەیم بینی، کە چۆن لەسەر تەپڵی سەری تۆپەڵی کردبوو. خۆمانم هاتەبەرچاو، لەکاتی زۆرانبازیکردندا لە باخەکەی تەنیشت ماڵی خۆمان، چۆن دەکەوتین و سەرئەژنۆی کاوبۆکانمان بەئاوی سەر چیمەنەکە تەڕدەبوون. (پیتەر)م هاتە بەرچاو کە لەبەردەم ئاوێنەکەدا دەوەستا، فڵچەیەکی ددان شتنی دەکرد بە مایکرۆفۆن و دەکەوتە گۆرانی گوتن. خۆمانم بینی کە دەچووین بۆ هەورەبانەکە خۆمان دەشاردەوە و دەمانگوت بزانین دایک و باوکمان دەماندۆزنەوە. دواتر (پیتەر)م وەک کەسێکی پێگەیشتوو هاتەبەرچاو، کە خەریکبوو نەخۆشیی پەکی دەخست، دەموچاوی زەرد هەڵدەگەڕا، بەهۆی دەرمانەکانییەوە تادەهات لاوازتر دەبوو.

لەمۆرییم پرسی: باشە پیتەر بۆ نایەوێت من ببینێ؟

مامۆستا کۆنەکەم ئاهێکی هەڵکێشا و وەڵامی دامەوە: لەپەیوەندییەکاندا یاسا و ڕێسای نەگۆڕ بوونیان نییە، بەڵکو دەبێ هەموو شتێک لەسەر بنەمای خۆشەویستیی گفتوگۆی لەسەر بکرێ، بۆشایی بهێڵدرێتەوە بۆ بۆچوونەکانی هەردوولا، هەر لایەک گرنگی بە ویست و پێویستییەکانی بەرامبەرەکەی بدات، هەردوولا دۆخی ژیانی یەکتری لەبەرچاو بگرن و لەخۆیان بپرسن، کە دەتوانن چی بۆ بەرامبەرەکەیان بکەن.

لەسەرمایەدارییدا، خەڵک گفتوگۆ دەکات بۆ ئەوەی زۆرترین قازانجی دەستبکەوێ، گفتوگۆ دەکەن بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتەی دەیانەوێ، ڕەنگە خۆت زۆر ئەوەت کردبێ. خۆشەویستیی جیاوازە. خۆشەویستیی ئەوەیە چۆن گرنگی بە بارودۆخی خۆت دەدەی ئاواش گرنگی بە بارودۆخی بەرامبەرەکەت بدەی. میچ، تۆ ئەم

هەموو کاتە خۆش و تایبەتانەت لەگەڵ براکەت بەسەربردووە و دواتر نەماون، ئێستاش دەتەوێ دووبارە دروستییان بکەیتەوە. دەزانم هەرگیز نەتویستووە ئەو ساتانە کۆتاییان بێ، بەڵام تەواو بوون و دەستپێکردنەوەکان بەشێکن لە سروشتی مرۆڤبوون. دەوەستێت، تازە دەبیتەوە، دەوەستێت، تازە دەبیتەوە. بەوشێوەیە.

سەیری چاوەکانیم کرد، هەموو مردنی سەر دونیام بینی. زۆر هەستم بە بێدەسەڵاتیی کرد.

مۆریی گوتی: ڕێگایەک هەر دەدۆزیتەوە بگەیتەوە بەبراکەت.

- چۆن دەزانی؟

بەزەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دامەوە: ئەوەنییە بە منیش گەیشتیتەوە!

***

مۆربی بیمدەلنب: مبج، لەم ڕۆژانەدا چیرۆکێکی کورتی خۆشیان بۆ گێڕامەوە.

بۆ ساتێک چاوەکانی دادەخات و منیش چاوەڕێدەکەم.

- چیرۆکەکە دەربارەی شەپۆلێکە، کە ماوەیەکی زۆرە لە زەریایەکدا دێ و دەڕوا. چێژ لە بایەکە و لە هەوا پاکەکە وەردەگرێ. پاش ماوەیەک دەبینێ چۆن شەپۆلەکانی پێشییەوە دەدرێن بە کەنارەکەدا و نامێنن. ئەم شەپۆلەش دەیکا بە هاوار و دەڵێ: وای خوایە چی بکەم! ئێستا منیش ئاوام بەسەردێ. لەمکاتەدا شەپۆلێکیتر بەلایدا تێدەپەڕێ و بەپێکەنینێکەوە پێی دەڵێ: چییە بۆ وا دەکەی؟

شەپۆلی یەکەم وەڵام دەداتەوە: تۆ ئاگات لە هیچ نییە، هەموومان بەر کەنارەکە دەکەوین و تێدادەچین. هیچمان لێنامێنێتەوە. ئەوە هەروا کەمە؟ لەبەرئەوەیە ئاوا بێتاقەتم.

شەپۆلی دووەمیش پێی دەڵێ: نەخێر ئەوە تۆی تێنەگەیشتووی لە شتەکە. تۆ شەپۆل نیت، بەڵکو بەشێکیت لە زەریاکە.

زەردەخەنەیەک دەکەم و مۆرییش لای خۆیەوە چاوەکانی دادەخاتەوە.

**هەر دووبارەی دەکاتەوە: بەشێکیت لەزەریاکە، بەشێکیت لە زەریاکە.**

**هەناسە هەڵدەمژێت و دەیداتەوە، منیش چاوی لەسەر لانابەم.**

# سێشەممەی چواردەیەم

## ماڵئاوایی دەکەین

کەش سارد و شێدار بوو، بەقاردمەکانی بەردەم ماڵی مۆرریدا سەرکەوتمە سەرەوە. هەندێک شتم بینی، کە لەوەو پێش لە میچکام لەسەردانەکانمدا نەمبینیبوون: گردەکەی ئەوبەر ماڵمان، ڕووکاری خانووەکەیان، کە بەبەرد دروستکرابوو، هەروەها گوڵ و دەوەنەکانی ناو حەوشەکەی دەرەوەیان. بەهێواشی دەڕۆیشتم و قاچم دەنا بە گەڵا مردووە تەڕەکاندا و لەگەڵ زەویەکە ڕێکم دەکرن

ڕۆژی پێشوو شارلۆت تەلەفۆنی بۆ کردبووم و پێیگوتبووم، کە مۆریی حاڵی باش نییە. شارلۆت لەڕاستیدا بەمشێوەیە پێیگوتم، کە ڕۆژەکانی کۆتایی ژیانی مۆریی نزیک بوونەتەوە. مۆریی سەردانی هەموو هاوڕێ و ناسیاوەکانی هەڵوەشاندبۆوە و ئێستا زۆربەی کاتەکانی خۆی بە نوستنەوە بەسەردەبرد. مۆریی پێشتر وانەبوو، زۆر کەم گرنگی بە نوستن دەدا. تەنها کاتێک دەیویست بنوێت، کە کەسی لەلا نەبوو قسەی لەگەڵدا بکات. شارلۆت پێیگوتم' مۆریی دەیەوێ سەردانی بکەی، بەڵام میچ....

- بەڵێ؟

- زۆر لاواز بووە.

لەنزیکەوە لە پلیکانەکان و دەرگای حەوشەکەیان ورد دەبوومەوە،

وەک ئەوەی یەکەمجارم بێت بیانبینم. لەسەر جلەکانمەوە هەستم بە تۆمارەکەرەکە دەکرد، کە لەناو جانتاکەمدا بەشانمەوە بوو جانتاکەم کردەوە و ویستم دڵنیابم لەوەی شریتم پێیە. کۆنیی هەرچەندە زۆربەی کات ڕووخساری وەک ڕووخساری کەسێکی دڵخۆش دەردەکەوت، بەڵام ئەمجارە بەئاشکرا دەمبینی خەمێکی گەورە لەسەر ڕووخساریەتی، تەنانەت بەدەنگێکی زۆر نزمیش بەخێرهاتنی کردم.

هەواڵی (مۆریی)م لێپرسی. لێوی خوارەوەی خۆی گەست و گوتی: بەخوا بڵێم چی، باش نییە. نامەوێ بیر لە کۆتاییەکەی بکەمەوە، بۆخۆت دەزانی چەندە پیاوێکی باش و خۆشەویستە.

من دەمێک بوو ئەوەم دەزانی.

- بەڕاستی بەداخەوە کە شتەکان ئاوان، میچ.

شارلۆت لە هۆڵەکە باوەشی پێداکردم. هەرچەندە سەعات هبوو بە دە، بەڵام پێیگوتم کە مۆریی جارێ هەڵنەستاوە، لەبەرئەوە چووین بۆ مەتبەخەکە. یارمەتی (شارلۆت)مدا لە کۆکردنەوەی ئەو شتانەی لەوێ بوون، چەندین قوتوی حەب لەسەر کەوانتەرەکە ڕیزکرابوون، لەسوپایەک دەچوون بە جلی قاوەیی و کڵاوی سپییەوە. مۆریی ئێستا بۆ ئاسانکردنی هەناسەدانی حەبی (مۆرفین)ی دەخوارد. ئەو خواردنەی لەگەڵ خۆم هێنابووم، شۆربا و کێکی میوە و زەڵاتەی تونە بوو. هەموویم خستە سەلاجەکەوە و داوای لێبووردنم لە شارلۆت کرد، کە ئەو شتانەم هێناوە، چونکە مۆریی ماوەی مانگێکیش زیاتر بوو نەیدەتوانی لەو جۆرە خواردنانە بخوات. من و شارلۆت هەردووکمان ئەوەمان دەزانی، بەڵام ئەو هەست کردنە لەسەردانەکانمدا بۆ من وەک خوویەکی لێهاتبوو. هەندێکجار، کە خەریکە کەسێک لەدەست دەدەیت، چەندین مامەڵەی تەقلیدی و

خوری کۆنت تیا زینـدوو دەبنـەوە.

چوومە ژووری میوانەکە دانیشتم. ئەو ژوورەی مۆریی و تێد یەکەم چارێنکەوتنیان تیادا کرد. سەیرێکی ئەو ڕۆژنامەیەم کرد کەلەسەر مێزی ناوەڕاستی ژوورەکە دانرابوو: دوو منداڵ لە ویلایەتی مینۆسۆتا لەکاتی یاریکردن بە دەمانچەکانی باوکیان تەقەیان لەیەکتری کردبوو. منداڵێکی ساوا لەتەنەکە خۆڵێکدا لە لۆس ئەنجلوس دۆزرابۆوە...

ڕۆژنامەکەم دانا و کەوتمە تەماشاکردنی کووورەی ئاگرەکە، بەهێواشیش قاچم دەدا بە زەوی ژوورەکەدا، کە تەختەبوو. دواجار گوێم لێبوو دەرگایەک کرایەوە و داخرایەوە، ئینجا بە تەپەکانی پێیدا زانیم (شارلۆت)ە بەرەو لای من دێت.

بەهێواشی گوتی: هەستاوە، دەتوانی بچیت بۆ لای.

هەستام و بەرەو ژوورەکەی مۆریی ڕۆیشتم، لە بەشی سەرەوەی هۆڵەکە ژنێک بەچوارمشقی دانیشتبوو، کە نەمدەناسی. خەریکی کتێب خوێندنەوە بوو. دواتر زانیم یەکێک لەو سستەرانە بوو، کە دەبوو شەو و ڕۆژ لای مۆریی بن.

مۆریی لەو ژوورەیان نەبوو. پێم سەیر بوو. دواتر بەدوو دڵییەوە بەرەو ژووری نوستنەکە ڕۆیشتم. لەوێ بوو، لەسەر جێگاکەی خۆی لەژێر بەتانییەکەوە پاڵکەوتبوو. یەکجاریتر لەم شێوەیەدا بینیبووم، کاتێک مەساجیان بۆ دەکرد. بەبینینی مۆریی لەو دیمەنەدا دووبارە قسەکەی خۆیم بیر کەوتەوە، کە دەیگوت: کە لەجێگادا کەوتی، مردووی.

لەگەڵ چوونە ژوورەوەمدا بەزۆر زەردەخەنەیەکم خستەسەر دەموچاوم. مۆریی چاکەت و بیجامەیەکی زەردی لەبەربوو، بەتانییەکیش لە سنگییەوە تا خوارەوەی داپۆشیبوو. ئەوەندە بچووک دەینواند دەتگوت جەستەی شتێکی کەمە. هێندەی منداڵێکی لێمابۆوە.

دەمی کرابۆوە و پێستی تەواو زەردهەڵگەڕابوو، ئێسقانەکانی دەموچاویشی دەرپەڕیبوون. چاوی خستەسەرم و هەوڵیدا قسەبکات، بەڵام تەنها گوێم لە نووزەیەک بوو.

هێزێکی زۆرم دایە بەرخۆم و دیسان بەزەردەخەنەیەکی ساختەوە گوتم: ئەوەتای دۆزیمیتەوە.

هەناسەیەکی هەڵمژی و زەردەخەنەکەی بۆ کردمەوە. دیاربوو بە ئەوەندە هیلاک بوو. دواجار گوتی: هاالو...ڕێ... ئازیزەکەم.

پێمگوت: من هاوڕێی تۆم، مۆریی.

- ئەمڕۆ باش نیم، میچ.

- بەیانی باشتر دەبی.

هەناسەیەکیتری دایەوە و دیاربوو زۆری لەخۆی کرد تا توانی سەرێک بۆ قسەکەم بلەقێنێت. هەستمکرد دەیەوێت شتێک بکات و ناتوانێت، بەڵام هەرزوو تێگەیشتم، کە دەیویست دەستی لەژێر بەتانییەکە دەربهێنێت.

- بەتانییەکە...

بەتانییەکەم لادا و پەنجەکانیم گرت. دەستبەجێ لەناو پەنجەکانی مندا دیارنەمان. هەندێک خۆم لە دەموچاوی نزیک کردەوە و بۆیەکەمجار بە کەمێک ڕیشەوە بینیم. بەو مووە سپییانەوە، کە هەریەکەیان لەشوێنێکەوە هاتبوونەدەر دەتگوت کەسێک لەسەر ڕوومەت و چەناگەی خوێدانی ڕاوەشاندووە. جەستەیەک، کە سەرتاپای شەکەت ببوو لەکوێ دەیتوانی ڕیشێکی زیندووی پڕ ژیانی لێ بێتەدەرەوە.

بەهێواشی بانگم کرد: مۆریی؟

بۆی ڕاستکردمەوە: ڕاهێنەر!

ئەمجارەیان بە (ڕاهێنەر) بانگم کردەوە.

ئەزوویەک بەهەموو گیانمدا هات. مۆریی وشە وشە قسەیدەکرد، هەناسەی هەڵدەمژی و وشەی دەدایەوە. دەنگی تەواو لاواز و کز بوو. سەرتاپا جەستەی بۆنی مەلهەمی لێدەهات.

پێیگوتم: میچ، تۆ ڕۆحێکی باشی.

- ڕۆحێکی باش؟

بەچپە گوتی: میچ، تۆ هاتیتەناو...

هەردوو دەستی گرتم و خستنیە سەر دڵی: ئێرەمەوە.

هەستمدەکرد قورگم کون بووە وا قسەم بۆ نەدەکرا. دواجار زۆرم لەخۆم کرد و گوتم: ڕاهێنەر گیان؟

- بەڵێ.

- من نازانم چۆن ماڵئاوایی بکەم.

بەهێواشی دەستی خستەسەر دەستم، کە هێشتا هەر لەسەر سنگی بوو: بەمشێوەیە ماڵئاوایی دەکەین.

بەهێواشی هەناسەی دەدا. هەستم بە قەفەزەی سنگی دەکرد، کە بەرز و نزمی دەکرد.

بەنووزە پێیگوتم: خۆشم دەوێی.

- منیش خۆشم دەوێ ڕاهێنەری گەورەم.

- دەزانم خۆشت دەوێم..شتێکیتریش دەزانم؟

- چی تر؟

- ئەوەی کە... هەمیشە..خۆشت ویستووم.

چاوەکانی بچووک کردەوە و دەستیکرد بە گریان. دەموچاوی لە دەموچاوی منداڵێک دەچوو، کە نەزانێت چاو چۆن فرمێسکی لێدێتەدەر. بۆ چەند خولەکێک بەباوەشی خۆممەوە نوساند و دەستم بەقژیدا هێنا، ئینجا بەری دەستم خستەسەر ڕومەتی و هەستم بە ئێسقانە ڕەقەکانی و فرمێسکە تەڕەکانی کرد، کە دەتگوت لە دەمی

قوتویەک ئاوی پاڵێوراوەوە دێنەدەر.

کاتێک هەناسەدانی ئاسایی بۆوە، قورگم پاککردەوە و پێمگوت: دەزانم هیلاک و بێتاقەتی، دەڕۆم و سێشەممەی ئایندە دێمەوە.

چاوەڕێمدەکرد بەو قسەیە کەمێک بێتەوە سەر خۆی، بەڵام بەدەنگێکی نزم گوتی: سوپاس. ئینجا بەهێواشی فنێکی کرد و دواتر کردی بەپێکەنین. هەردوو دەنگەکە دڵتەنگکەر بوون.

جانتا نەکراوەکەمم هەڵگرت، کە تۆمارکەرەکەی تێدابوو. ئەسڵەن چ پێویستی دەکرد تۆمارکەر بەرم، دەمزانی ئیتر بەکاریناهێنین. بەسەریدا نوشتامەوە و ماچم کرد. دەموچاوم خستەسەر دەموچاوی، ڕوومەت لەسەر ڕوومەت، پێست لەسەر پێست، ئەمجارەیان زیاتر لەجاران لەو بارەدا مامەوە و قایمتر بەخۆممەوە نوساند، بەوهیوای ئەگەر تۆزێکیش بووە دڵی خۆشبکەم.

لەگەڵ هاتنەوە دواوەمدا گوتم: زۆر باشە مۆریی گیان.

بەچاو تروکاندن فرمێسکەکانم گەڕاندەوە دواوە و ئەویش لێوەکانی خستەوە سەریەک و بەدەم سەیرکردنی دەموچاوی منەوە هەردوو برۆی بەرز کردەوە. هیوادارم ئەوە ساتێکی خۆش بووبێت بۆ مامۆستا کۆنە خۆشەویستەکەم، کە دواجار وایلێکردم بگریم.

ئینجا ئەویش بەچپە گوتییەوە: باشە میچ گیان.

# دەرچوون

مۆریی لە بەیانییەکی شەممەدا کۆچی دوایی کرد. لەکاتی گیان سپاردنەکەیدا ئەندامانی خێزانەکەی لەدەوری بوون. ڕۆب توانیبووی لە (تۆکیۆ)وە بگەڕێتەوە و ماچی ماڵئاوایی باوکی بکات، (جۆن)یش لەوێ ببوو، بێگومان (شارلۆت)یش، ئامۆزایەکی (شارلۆت)یش بەناوی (مارشا) ئەو بەیانییە هاتبوو بۆ ماڵی مۆریی. هەر (مارشا)ش بوو لە مردنە نارەسمییەکەی مۆرییدا شیعرێکی خوێندبۆوە، کە بۆ مۆریی نووسیبوو. ئەو شیعرەی کە تیادا مارشا مۆریی وەک سنەویەرێکی بڵندی هەمیشە سەوز وەسف کردبوو.

ئەو چەند ڕۆژەی پێش مردنەکەی، ئەندامانی خێزانەکە بەنۆرە لە تەنیشت مۆرییەوە دەنوستن لەبەرئەوەی مۆریی دوو ڕۆژ دوای سەردانەکەی من کەتبووە حاڵەتی بێهۆشییەوە و پزیشکێکیش گوتبووی دەکرێت لەهەر کاتێکدا بێت گیان لەدەست بدات، بەڵام مۆریی دوانیوەڕۆیەکی ناخۆش و شەوێکی تاریکی تریشی تێپەڕاندبوو.

لەکۆتاییدا، لە چواری مانگی نۆڤەمبەردا کاتێک خۆشەویستەکانی بۆ چەند ساتێک ژوورەکەیان بەجێهێشتبوو بۆ ئەوەی قاوەیەک لە مەتبەخەکە بێنن، مۆریی لەهەناسەدان کەوتبوو.

بڕوام وایە مۆریی بەمەبەست بەوشێوەیە مردبێت. وای بۆدەچم نەیویستبێت لەکاتی دوا هەناسەیدا کەس بیبینێت و دواتر بەهۆی

ئەو دیمەنەوە ئەو کەسە ئازاری دەروونی ببینێت، هەروەکو چۆن مۆریی خۆی بە خوێندنەوەی بەڵگەنامەی مردنی دایکی و ناسینەوەی تەرمی باوکی ماوەیەکی زۆر ئازاری دەروونی چەشت.

بڕوام وایە زانیویەتی لەماڵی خۆیدایە و لەسەر جێگاکەی خۆیەتی، کتێبەکانی و وتە نوسراوەکانی و گوڵە زەنبەقەکەی لێوە نزیکە. هەمیشە دەیویست بە ئارامیی گیانی دەرچێت، ویستەکەشی هاتەدی.

مەراسیمی بەخاکسپاردنەکەی لەبەیانییەکی شێدارادا ئەنجامدرا. بایەکی کەمێک بەهێزیشی دەهات. گیاکە تەڕبوو، ئاسمانیش ڕەنگی شیری هەبوو. هەموومان بەچواردەوری ئەو چاڵە بچووکەدا وەستابووین، کە هەڵیانکەندبوو، شوێنەکە زۆر نزیک بوو لەو ڕووبەرە ئاوییەوە، کە مۆریی دەیگوت، بەشێوەیەک دەمانتوانی گوێمان لە دەنگی ئاوەکە و فڕەی باڵی مراوییەکان بێت. هەرچەندە سەدان کەس ویستبوویان ئامادەی مەراسیمەکە بن، بەڵام شارلۆت نەیویستبوو مەراسیمەکە گەورە بێت، تەنها هەندێ خزم و هاوڕێی نزیکی خۆیانی ئاگادارکردبۆوە بێن. ئاکسیلرۆد چەند شیعرێکی خوێندەوە. (دەیڤد)ی برای مۆریی، کە هێشتاش بەهۆی ئەو ئیفلیجییەی لەمنداڵیدا توشی بوو دەشەلی، وەک نەریتێک خاکەنازەکەی هەڵگرت و کەمێک خۆڵی کرد بەسەر گۆڕەکەدا.

کاتێک خۆڵەمێشەکەی مۆرییان خستەناو گۆڕەکەوە، لەجێی خۆمەوە چاوێکم بەسەر گۆڕستانەکەدا گێڕا. مۆریی ڕاستی کرد، شوێنەکەی زۆر خۆش بوو، گردێک کە هەمووی درەخت و گژوگیا بوو. قسەکەیم بیر کەوتەوە، «ئەو کاتە تۆ قسەبکە و من گوێت لێ دەگرم.»

هەوڵمدا لەمێشکی خۆمدا ئەوە بکەم و دوای کەمێک هەستمکرد

گفتوگۆکـە زۆر لــە گفتوگـۆی ڕاسـتی دەچێـت. سـەرم داخسـت و تەماشـایەکی سـەعاتەکەم کـرد. تێگەیشـتم گفتوگۆکـە بـۆ ئەوەنـدە لەڕاسـتی دەچێـت: سێشـەممە بـوو.

باوکم بەناو ئەوان و ئێمەدا دەهات و دەچوو
گۆرانی بۆ گەڵای درەختەکان دەگوت
هەموو منداڵەکان دڵنیابوون لەوەی بەهار
بەدەم گوێگرتن لە گۆرانییەکانی باوکمەوە دەکەوێتە سەما!

شیعری (ئی ئی کەمینگز) کە لەمەراسیمی بەخاك سپاردنەکەی (مۆریی)دا لەلایەن (ڕۆب)ی کوڕە گەورەی (مۆریی)ەوە خوێندرایەوە.

# کۆتایی

هەندێکجار بیر لەخۆم و ژیانم دەکەمەوە، بیر لەوکاتە دەکەمەوە، کە هێشتا نەگەڕابوومەوە بۆ لای مامۆستا کۆنەکەم. دەمەوێت قسە لەگەڵ ئەو (میچ)ە بکەم. دەمەوێت پێیبڵێم بۆ چ شتێک بگەڕێت و خۆی لەکام هەڵانە لابدات. دەمەوێت پێیبڵێم کراوەتر بێت. دونیای پارە پشتگوێ بخات، گرنگیی بە کەسە خۆشەویستەکانی بدات کاتێک قسەی بۆ دەکەن، گرنگییەک وەک ئەوەی کۆتاجار بێت گوێی لێیان دەبێت، لەهەمووی گرنگتر دەمەوێت بەو (میچ)ە بڵێم تا زووە سوار فڕۆکە بێت و بچێت بۆ سەردانی ئەو پیاوە پیرە مەزنەی لە (وێست نیوتۆن)ی ماساچوستس دەژی، دەمەوێت هانی بدەم پێش ئەوەی ئەو پیاوە پیرە نەخۆش بێت و توانای سەماکردن لەدەست بدات سەردانێکی بکات.

دەزانم ئەمە بووە بەڕابردوو، ئێستا ناتوانم بیکەم. هیچکام لەئێمە ناتوانێت کاتێک بگەڕێنێتەوە، کە تێپەڕیوە، یان دەستکاری ژیانێک بکات، کە نوسراوەتەوە، بەڵام ئەگەر مامۆستا مۆریی شوارتز شتێکی فێری من کردبێت ئەمە بووە: شتێک نییە لەژیاندا بەناوی «تازە ئیتر درەنگە». مۆریی تا ئەو ڕۆژەی ماڵئاوایی لێکردین هەر لە گۆڕاندابوو.

بەماوەیەکی کەم دوای مردنی مۆریی، گەیشتمە لای براکەم لە

نیسپانیا. گفتوگۆیەکی درێژمان کرد. پێمگوت کە ڕێزم لەبڕیارەکەی گرتووە، کە ویستویەتی دووربێت، بەڵام ویستووشمە پەیوەندییمان هەبێت و تا ئەو شوێنەی دەکرێت لەژیانیدا هەبم و ئاگام لێی بێت.

پێمگوت: تۆ برامیت. نامەوێت لەدەستت بدەم. خۆشم دەوێیت.

پێشتر هەرگیز شتی وام پێنەگوتبوو. دوای چەند ڕۆژێک نامەیەکم بەفاکس بۆ هات. دێڕەکان بەبڵاوی نوسرابوون و خاڵبەندییەکەیان باش نەبوو، پیتەکانیش هەموو پیتی گەورە بوون. براکەم هەمیشە بەپیتی گەورە دەینوسی.

لەنامەکەیدا هەواڵی لەسەر کۆمەڵێک شت دابومێ، باسی هەندێک لەو شتانەشی بۆ کردبووم، کە لەو چەند هەفتەیەی ڕابردوودا خەریکیان ببوو، کۆمەڵێک قسەی خۆشیشی تێدابوو. کۆتایی نامەکەی بەمشێوەیە بوو:

ئێستا دڵەکزە و سکچوونمە. ژیانیش زۆر بێقیمەتە. بەمزووانە قسە دەکەین.

قن سوتاوەی برات.

ئەوەندە پێکەنیم چاوم پڕبوو لە ئاو.

***

نوسینی ئەم کتێبە زیاتر بیرۆکەی مۆریی بوو. ئەو ناوی نابوو: کۆتا پرۆژەمان بەیەکەوە. ئەم کتێبە وەکو باشترین پرۆژەی هاوبەشی نێوان من و مۆریی، زۆر لەیەکتری نزیک کردینەوە. (مۆریی)ش زۆری پێخۆش بوو کاتێک چەندین دەزگای بڵاوکردنەوە ئامادەییان نیشاندا کتێبەکە چاپ بکەن، بەڵام بەداخەوە مۆریی فریا نەکەوت کتێبەکە بە چاپکراوی ببینێت. ئەو پارەیەی پێش بڵاوبوونەوەی کتێبەکە وەرمانگرت یارمەتیەکی زۆری (مۆریی)دا لە دابینکردنی

ئەو خەرجییانەدا، کە بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە کەوتبوونە سەری. هەردووکیشمان بۆ ئەوە زۆر دڵخۆش و سوپاسگوزار بووین.

بەنیسبەت ناونیشانی کتێبەکەشەوە، ڕۆژێک لە ژوورەکەی (مۆریی)دا پێکەوە بڕیارمان لەسەردا. مۆریی حەزی لەناونانی شتەکان بوو. ناونیشانی زۆری پێشنیازکرد بەڵام کاتێک وتم: (سێشەممان لەگەڵ مۆریی)ت پێ چۆنە، بەشەرمێکەوە زەردەخەنەیەکی کرد. ئینر تێگەیشتم خۆیەتی.

دوای ئەوەی مۆریی مرد، ڕۆژێک ئەو سندوقەم کردەوە، کە شتی سەردەمی زانکۆم تێدا هەڵگرتبوو. دوا نووسینی خۆمم دۆزییەوە، کە بۆ وانەکەی مۆریی نووسیبووم. بیست ساڵ بەسەر ئەو نووسینەدا تێپەڕیبوو. لەسەر لاپەڕەی یەکەم چەند تێبینییەکەم بە قەڵەمی دار بۆ مۆریی نوسیبوو، لەژێر ئەوانیشەوە مۆریی تێبینییەکانی خۆی لەسەر نووسینەکەم نووسیبوو.

ئەوانەی من هەموو بە «ڕاهێنەری خۆشەویستم» دەستیان پێدەکرد ئەوانەی ئەویش بە «یاریزانی ئازیز». هەر جارێک ئەو نووسینەنانە دەخوێنمەوە زیاتر بیری مۆریی دەکەم.

هەرگیز بەڕاستی مامۆستایەکت هەبووە؟ مامۆستایەک تۆی وەک کەرەستەیەکی خاوی زۆر بەنرخ ببینیبێت؟ وەک خشڵێک، کە ئەگەر عاقڵانە ڕووپۆشی بکەیت دەبێتە شتێکی زۆر بەبەها؟ ئەگەر بەختت هەبێت و ئەو ڕێگایە بدۆزیتەوە، کە دەتگەیەنێتە مامۆستایەکی ئاوا، بەزوویی دەکەویتەسەر ڕێگای ڕاست. هەندێکجار ئەو ڕێگە ڕاستە لەمێشکی خۆتەوە دەستپێدەکات، هەندێکجار لەتەنیشت جێگای مامۆستاکەتەوە.

مامۆستا کۆنەکەم دوا کۆرسی ژیانی هەفتەی جارێک لەماڵەکەی خۆی و لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەیدا گوتەوە. لەو ژوورەدا مامۆستا بەدەم وانە گوتنەوەوە زۆر زۆر سەیری گوڵە زەمبەقەکانی دەکرد و سەرنجیدەدا چۆن گوڵە پەمەییەکانیان دەکرێنەوە. کۆرسەکە سێشەممان دەخوێندرا. لەسەر هیچ کتێب و پرۆگرامێک نەدەڕۆیشت، یەک وانەشی هەبوو: «مانای ژیان،» کە لەئەزموونەوە دەگوترایەوە.

وانەکە بەردەوامە...